زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان

ئەلقەی سێیەم

علی باپیر

# بەدوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێک دەکەین ؟!







# بەدورخستنەوەی

# ئافرەت لە ئیسلام

# چ زیانێک دەکەین ؟!

# بەدوورخستنەوەی

# ئافرەت لە ئیسلام

# چ زیانێک دەکەین؟!

عەلی باپیر



بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن

| | |
|---|---|
| ناوی کتێب: | بەدوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلامدا چ زیانێک دەکەین |
| نوسەر: | عەلی باپیر |
| بلاوکردنەوەی: | نوسینگەی تەفسیر/ هەولێر |
| خەت: | نەوزاد کۆیی |
| بەرگ: | أمین مخلص |
| سالی چاپ: | ٢٠٠٧ز-١٤٢٨ك |
| تیراژ: | ٣٠٠٠ دانە |

لە کتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی (٩٥٢) ی سالی

تەفسیر
بۆ بلاوکردنەوە و راگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا زێر تونێلی شێرین بالاص
ت: ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨ - ٢٥١٨١٣٨
موبایل: ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَاللّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَيُرِيدُ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الشَّهَوَاتِ أَن تَمِيلُواْ مَيْلاً عَظِيمًا﴾

## پێشکەش بێ

بەو ئافرەتانەی کە لە ژێر هیچ فشارێك دا و بە هیچ نرخێك دەستبەرداری ڕەسەنایەتی ئیسلامیی و نەتەوەیی خۆیان نابن و ،بەدەم گێژەڵووکەی لاساکردنەوەی کوێرانەوە ناچن.

## پێشەکی

خوێنەری بەڕێز:

ئەم نامیلکەیە لە ئەسڵ دا وتارێك بوو کە لە مانگی (٥ی ٢٠٠٦) لە هۆڵی ((پێنجی ئازار)) لە شاری (ڕانیە) لە کۆڕێکی تایبەت بە ئافرەتان دا، دراوە و پاش هێنرانە سەر کاغەز[1] و چاوپێداچوونەوەی بەمشێوەیەی لێهاتوە.

هیواداریشم ئەم نامیلکەیە ببێتە مایەی بەرچاو ڕوونیی و بێداریی و هۆشیاریی خوشکانمان بە هەموو جۆر و ئاراستەکانیانەوە کە بەداخەوە لەم هەل و مەرجەدا لە ژێر فشارێکی زۆردان بۆ لادان و دوورخستنەوەیان لە ئیسلام لە ڕووی عەقیدە و فیکر و خووڕەوشت و داب و نەرێت و...هتدەوە.

هەڵبەتە من دڵنیام کە ئەم شەپۆل و تەوژمی سیکۆلاریزم و لیبڕالیزم و دنیاگەرایی و ماددە پەرستی یەی ئێستاش سەرئەنجامی هەروەك شەپۆل و تەوژمی مارکسیزم و کۆمۆنیزمەکەی ڕابردوو دەبێ و هێندەی پێناچێ بازاڕی ئەومیش دەشکێ و لە برەو دەکەوێ، بەڵام بێگومانیش وەك چۆن کاتی خۆی گەلێك کەس لە زۆنگاوی

---

[1] - سەرەتا برایەکی بەڕێزمان بەناوی :( احسان محمد) هێناویەتە سەر کاغەز و هەندێك لە لەفەرموودەکانیشی(تخريج) کردوە و، دوایش کاك ملا بلال قەڵادزەیی دووبارە بە خەتێکی خۆش و پاش چاو پێداگێڕانەوەی خۆم نووسیویەتەوە،خوا بەچاکترین شێوە پاداشتیان بداتەوە.

مارکسیزم دا خنکان و لە بیابانی کۆمۆنیزم دا سەریان بە فەتارەت چوو، زۆنگاو و گێژاوی سیکۆلاریزم و لیبڕالیزمیش خەڵکێك سەری تێیان دا بە فەوتان دەچێ!

جا دیارە ئینسانیش تەنیا یەك ژیانی هەیە و بەس یەك جار لەم سەر خڕۆکەی زەوی یە تاقی دەکرێتەوە، نەك دوو سێ جار بژی و تاقی بکرێتەوە تاکو ئەگەر لەیەك دووانێکیان دا ڕێی هەڵەی گرت و تێی دۆڕاند لەوانی دیکەدا زەرە و زیانەکەی پڕبکاتەوە و دۆڕانەکەی قەرە بوو بکاتەوە!

کەواتە:

هەموو ئینسانێك دەبێ چاك وردبێتەوە و ڕامێنێ بەر لەوەی هیچ هەنگاوێك بنێ و پێ هەڵبێنێ، کە ژیانە دنیایی یەکەی لەسەر ڕێبازێکی ڕاست و دروست و بەرەو ئامانج و هەوارگەیەکی ڕەوا و شایستە دەست پێ بکات و بگوزەرێنێ، ئەگەرنا دوایی پەککو پەککو و پەشیمانی داد نادات وەك خوای دادگەر لەو بارەوە فەرموویەتی:

﴿حَتَّى إِذَا جَاء أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ارْجِعُون * لَعَلِّي أَعْمَلُ صَالِحًا فِيمَا تَرَكْتُ كَلَّا إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَائِلُهَا وَمِن وَرَائِهِم بَرْزَخٌ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾(المومنۆن-٩٩،١٠٠).

واتە: هەتا کاتێك یەکێکیان مردنی گەیشتە سەری، گوتی: پەروەردگارم: بمگێڕنەوە- بۆ دنیا- بەڵکو کردەوەی چاك بکەم لەو ژیانە دنیایی یەدا کە بەجێم هێشتوە - پێی دەگوترێ — نەخێر

بەڵكو ئەوە هەر قسەیەكە خۆی دەیكات — ئەگەر نا كەس گـوێی پێنادات — وە هەتا رۆژی زیندووكرانەوەیان پـەردە و نێوانێـك لـە پشتیانەوە هەیە — (واتە لە نێوان ئەوان و ژیانی دا ژیانێكی دیكە هەیە كە وەك پەردە و نێوانێك وایە لە نێوان دنیا و قیامەت دا).

هەروەها خوای دادگەر و كاربەجێ لە وەڵامی كەسانێك دا كـە لە دۆزەخ دا داد و فیغان و هاوار هاوار دەكەن كـە خـوا دەربازیـان بكات فەرموویەتی:

﴿...أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَاءكُمُ النَّذِيرُ فَـذُوقُوا فَمَا لِلظَّالِمِينَ مِن نَّصِيرٍ﴾ فاطر — ٣٧ .

واتە: ئەدی بایی ئەوەندە نەمانژیاندن و تەمەندارمان نـەكردن كە ئەگەر كەسێك ویستبای پەند وەربگـرێ و بێـدار بێتـەوە بـۆی دەلـوا، وە ئایـا ئاگـاردار كـەرەوەتان نەهاتـەلا؟! دەبیـچێژن دەی بێگومان سـتەمكاران هـیچ یارمەتیـدەریان نـین ئاشكراشـە كـە ئینسانی موسڵمان لەبەرامبەر مرۆڤایەتی دا بەگشتی و خـەڵك و خزمـان و نێزیكـانی خـۆی دا بەتایبـەت بەرپرسـیارە، بەتایبـەت كەسانێك كە خوای بەخشەر لە شـارەزایی لـە دیـن و شـەریعەتی خۆیدا بەهرەمەندی كردوون، وەك لەو بارەوە فەرموویەتی:

﴿وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةً فَلَوْلاَ نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّـنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي الدِّينِ وَلِيُنذِرُواْ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُواْ إِلَـيْهِمْ لَعَلَّهُـمْ يَحْذَرُونَ﴾ (التوبه — ١٢٢- )

واته:

وە بڕواداران بۆیان نیە تێکڕا بڕۆن بۆ جەنگ و جیهاد، باڵەهەر کۆمەڵێکیان دەستەیەکیان بچن بۆ گەڕان بەدوای زانیاری دا تاکو لە دین دا شارەزابن.وە بۆ ئەوەی کاتێك دەگەڕێنەوە لای خەڵکەکەیان وریا و ئاگاداریان بکەنەوە بەڵکو هۆشیار و بێدار ببنەوە.

جا بەندەش لەم نامیلکەیە و بەرهەم و هەنگاوەکانی دیکەشم دا- خوایاربێ – تەنیا ئەو هاندەرە دەجوولێنێ و لە خوای بەبەزەییش دەپاڕێمەوە بەرەکەت و پێزی زیاتر بخاتە کارو بەرهەمەکانمەوە و سەرەنجامی دنیا و دواڕۆژی هەموولایەکیشمان بە نیرومێ و ورد و درشتەوە خێربکات و لە عەیبداریی دنیا و گوناهباریی دواڕۆژ بە دوورمان بکات.

(٤) ی شەووالی ١٤٢٧

(٢٦) ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٦

هەولێر

## دەقی وتارەکە :

الحمد لله رب العالمين وصلى الله تعالى وسلم و بارك على حبيبنا و شفيعنا محمد و اله أجمعين من الصحب و الازواج و القرابة والتابعين لهم باحسان الى يوم الدين.

خوشكانی بەڕێزو خۆشەویستم! خۆشحاڵم كە بە دیدارتان شاد دەبم، ئەو بابەتەی كە بۆم ئامادە كردون ناو ونیشانەكەی بەم شێوەیە:

(بە دوور خستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێك دەكەین؟!)

كە دیارە لێرەدا مەبەستمان لە ئافرەت ئافرەتی موسڵمانی كوردە، خوشكە بەڕێزەكانم! هیوادارم ئەوەندەی بۆتان دەكرێت ئارامی و بێ دەنگی ڕەچاو بكەن، دیارە هۆڵەكەشمان گەرمەو ناڕادەیەك سەغڵەت دەبن، منیش ڕەچاوی كاتەكە دەكەم.

خوشكەكانم!

دیاردەی دوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام لە نێو كۆمەڵگای كوردەواری خۆماندا دیاردەیەكی زەق و ئاشكرایە، دیارە خەم خواردنی هەركامێكمان لە میللەت وكۆمەڵگای خۆی بە شێوەیەك كە ئەوەندەی بتوانین بەرژەوەندییەكانی دابین بكەین و خێرو قازانجی تووش بكەین، وە لە زەرەرو زیان بیپارێزین،ئەوە ئەركی سەرشانی هەركامێكمانە، وەك پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:

{كلكم راع و كلكم مسؤل عن رعيته} ٢ (متفق عليه)، واتـه: هەرکام لە ئێوە چاودێرە، وە بەرپرسیاریشە بەرانبەر بە خەڵك و کۆمەڵگایەکەی.

جا لە ڕاستی دا ئەگەر سەرنج بدەینە دام و دەزگاکانی ڕاگەیاندنمان — دیارە مەبەستم پێ ڕاگەیاندنی لایەنی دەسەڵاتدارە- بە ئاشکرا دیارە کە دەویسترێ ئافرەتی موسڵمانی کورد لە ئیسلام دوور بخرێتەوە، جا من لەم کۆڕەم دا باسی ئەوە دەکەم کە ئەگەر ئافرەت لە ئیسلام دوور کەوتەوە چ زیانێك دەکەین؟! ئاشکراشە هەرشتێك کە زیانی تێدابێ دەبێ دەستی لێ هەڵبگری، بەتایبەتی لەلایەن دەسنەلاتێکەوە کە دەبێ دڵسۆزی میللەت و کۆمەڵگاکەی بێت و لەسەری پێویستە هەوڵبدات چی خێرو قازانجە بۆی بێنێتە پێش و هەرچی زەرەرو زیانیشە لێی دوور بخاتەوە.

خوا پشتیوان بێت لە چوار تەوەرەدا باسەکەمان دەخەینە ڕوو کە ئەمانەن:

١- تێڕوانین و جیهانبینی ئیسلام بۆ ئینسان و ژیان و ئافرەت و خێزان.

٢- زیانەکانی دوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام

---

٢-كلكم راع و كلكم مسول عن رعيته فالامام وهو مسؤل عن رعيتة، والرجل راع فى بيت أهله وهو مسؤل عن رعيته، والمرأة راعيته فى بيت زوجها وهى مسؤلة عن رعيتها، والخادم راع فى مال سيده وهو مسؤل عن رعيته، والرجل راع فى مال أبيه وهو مسؤل عن رعيته، فكلكم راع وكلكم مسؤل عن رعيته)رواه الامام احمد و مسلم والبخاري و أبوداود والترمذي عن ابن عمر).

٣- پاساو و بیانووی دوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام
٤- چارەسەر.

## تەوەرەی یەکەم: تێڕوانین و جیهانبینی ئیسلام

لەم تەوەرەی یەکەم دا لە چوار خاڵان دا باسی تێڕوانینی ئیسلام دەکەین بۆ: مرۆڤ، ژیان، ئافرەت، خێزان، چونکە پێویستە پێشێ بزانین ئیسلام چی پێیە بۆ مرۆڤ،و چی لە مرۆڤدەوێ؟ و چی پێیە بۆ ژیان؟، وە چۆن تەماشا ئافرەت دەکات؟ و چۆن تەماشای خێزان دەکات؟ ئینجا ئەو ئیسلامەی کە ئەوە تێڕوانینیەتی بۆ مرۆڤو ژیان و ئافرەت و خێزان ئایا کاتێك ئافرەت لەو جۆرە ئیسلامە دوور دەکەوێتەوە چ زیانێك یان چەند جۆرە زیان دەکەین؟!

خاڵی یەکەم: مرۆڤلە جیهانبینی ئیسلام دا:

خوشکە بەڕێزەکانم! دەربارەی تێڕوانینی ئیسلام بۆ مرۆڤخوای بەدیهێنەر لە زۆر ئایەت دا بە ڕوونی و ڕاشکاویی باسی کردوە کە:

مرۆڤلە ڕوانگەی ئیسلامەوە جێنشینی خوایە و لە سەر زەوی دایناوە بۆ ئەوەی سەر زەوی ئاوەدان بکاتەوە، واتە بە شێوەیەك بژی کە ڕوو لە ئاوەدانی و گەشەکردن و بەرەو پێش چوون بێ، وە لە دوا ڕۆژیش دا بتوانێ بەڕەزامەندی خوا شادبێ، خوای بەرز و مەزن دەفەرموێ:﴿... وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ

خليفة...[3]﴾ واتە: وە كاتێك پەروەردگارت بە فریشتەكانی فەرموو: من جێنشینێك لەسەر زەوی دادەنێم..

وەفەرموویەتی :﴿... هُوَ أنشأكم مِّنَ الأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا [4]﴾ واتە خوا ئێوەی لە زەویدا پێگەیاندوە و ئاوەدان كردنەوەشی بە ئێوە سپاردووە..

هەروەها فەرموویەتی :﴿ إِنَّا جَعَلْنا ما عَلَى الْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا [5]﴾ واتە: ئێمە سەر زەوییمان ڕازاندۆتەوە بۆ ئەوەی تاقییان بكەینەوە داخۆ كامیان كردەوەی باشترە..

كەواتە خوا (عزوجل) سەر زەوی بۆ ئێمە ڕازاندۆتەوە و جۆرەها نازو نیعمەت و بەخششی پێداوین تاكو ژیان و گوزەرانمان ڕازاوە و درەوشاوە بێ و سوودیان لێ وەربگرین و لێیان بەهرەمەند بین، بەلاّم بۆچی؟! بۆ ئەوەی تاقیمان بكاتەوە بە ئەنجامدانی كردەوەی باش(العمل الصالح) ئینجا كردەوەی باشیش لە پابەندیی بە شەریعەت دا بەرجەستە دەبێ كە خوا بە پێغەمبەری خۆی دا (ﷺ) ناردوویەتی.

چونكە هەركاتێك مرۆڤ ، وەك تاك، خێزان، كۆمەڵگا، دەوڵەت، بە شەریعەتی خواوە پابەند بوو لە ڕاستی دا لە هەموو چاكەیەك نێزیك دەبێ و لە هەموو خراپەیەكیش دوور دەبێ! چونكە

---

٣- البقرة، ٣٠-

٤- هود-٦١ -

٥- الكهف ٧ -

**شەریعەتی خوای پەروەردگار لە هەموو بوارو لایەنەکان دا هەرچی چاکەیەفەرمانی پێکردوە و هەرچی خراپەیە قەدەغەی کردوە.**

## خاڵی دووەم: تێڕوانینی ئیسلام بۆ ژیان:

ژیانی دونیا لە ڕوانگەی ئیسلامەوە بریتیە لە تاقیگە،مرۆڤبۆ تاقیکردنەوە خوڵقێنراوە و ژیانی دنیاش تاقیگەیەکە تێیدا تاقی دەکرێتەوە، وەك خوای(جل جلاله) دەفەرموێ: ﴿الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ[٦]﴾ واتە: ئەو کەسەی مردن و ژیانی لەسەر زەوی ڕەخساندووە تاکو تاقیتان بکاتەوە داخۆ کامەتان کردەوەی چاکترە..

کەواتە ئێمە ژیانە دنیایی یەکەمان بریتیە لە تاقیگەیەك وەك گوتراوە {الدنيا مزرعة الاخرة} واتە: دنیا کێڵگەی دوارۆژە، هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا(ﷺ) مرۆڤی لە ژیانی دنیای دا وەك ڕێبوار تەماشا کردوە،{عن ابن عمر رضى الله عنهما قال أخذ رسول الله(ﷺ) بمنكبي فقال:كن فى الدنيا كأنك غريب أو عابر سبيل[٧]} واتە: پێغەمبەر(ﷺ) خوا شانەکانی گرتم و فەرمووی: لە ژیانی دنیات دا وا بزانە ئاوارە و بێ ئاشنا یان ڕێبواری.

کەواتە دەبێ لە دنیادا نەمامی کردەوەی باش بنێژین و کاری باش ئەنجام بدەین، چونکە لێرەدا تاقی دەکرێنەوە و ئەنجامەکەی لە دوارۆژ هەڵدەگرینەوە.

---

٦- الملك -- ٢ -

٧- رواه البخارى

ئەمە بە کورتی تێڕوانینی ئیسلامە بۆ ژیانی دنیا، ژیانی دنیا بریتی نیە لەوەی هەرچی زیاتر لەززەت و خۆشیی ماددی وەربگری بەبێ لەبەرچاو گرتنی دوا ڕۆژ و، بەبێ لەبەر چاوگرتنی ئەو حیکمەتەی ، کە مرۆڤبۆی دروستکراوە و، بەبێ لەبەر چاو گرتنی ڕەوشت و بەها بەرزەکان و بەرژەوەندیی خێزان و بەرژەوەندیی کۆمەڵگا و بەرژەوەندیی وەچەی تازە و نەوەی نوێ!!

بەڵکو دەبێ ئەوانە هەمووی لەبەر چاو بگیرێن، بەڵام بێگومان ئیسلامیش هیچ خێرو خۆشی و هیچ نازو نیعمەتێك کە ژیانی مرۆڤپێویستی پێیەتی لە مرۆڤقەدەغە نەکردوە، بەڵکو خوای بەخشەر زۆر بە ڕوونی فەرموویەتی هەرچی ڕزق و ڕۆزی پاك و چاکە و هەرچی نازو نیعمەتە بۆ مرۆڤەکانی خوڵقاندوە: ﴿قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالْطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ [٨]﴾ واتە : ئەی موحەممەد پێیان بڵێ: کێ ئەو جوانی و ڕازاوەیی یەی کە خوا لە زەوی دەری هێناوە وە ئەو ڕزق و ڕۆزی یە پاك و چاکانە، کە خوڵقاندوونی قەدەغەی کردوون، واتە: خوا خۆشی و نیعمەتەکانی دنیای لەبەندەکانی خۆی قەدەغە نەکردوە، بەڵکو هەر بۆ ئەوانی دروستکردووە، بەڵام دەبێ لەسەر ڕێبازی شەرع و چوارچێوەیەکدا کە قازانجی دنیاو دوا ڕۆژیان و بەرژەوەندی تاك و کۆمەڵیان

---

٨- الاعراف ٣٢ -

مسۆگەر بکات ئاوا خەڵك سوود لە نازو نیعمەتـەکان وەربگـرن و ئاوا لێیان بەهرەمەند بن.

## خاڵی سێیەم: تێڕوانینی ئیسلام بۆ ئافرەت:

خوای کار بەجێ ئەویشی زۆر بەڕوون و ڕاشکاویی خستۆتە ڕوو بۆ نموونە لەو باردوە فەرمووویەتی:﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللَّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا[9] ﴾ واتە: بەناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، ئەی خەڵکینە پارێز لەو پەروەردگارەتان بکەن کە ئێوەی لە نەفسێك دروستکردوە و هەر لەویش هاوسەرەکەی وەدی هێناوە ،وە لەو دوانەش پیاوان و ئافرەتانێکی زۆری بلاوکردۆتەوە(بە زەوی دا) وە پارێز لەو خوایە بکەن کە داوای شتی پێ لە یەکدی دەکەن،وە پارێز لە پەیوەندی یەکانی خزمایەتی بکەن (واتە مەیانپچڕێنن) بێگومان خوا بەسەرتانەوە چاودێرە.

کەواتە ئێمە هەموومان لە(ئادەم)ین و دایکیشمان (حەووا)یە سەلامی خوایان لێ بێ و ئەویش هەر لەو نەفسەی کە ئادەمی لێ دروست بوە و دروستکراوە، دوایی لەوانەوە وەچەی بەشەر زۆر بووە و کەوتۆتەوە و بەسەر زەوی دا دابەش بووە.

بەڵێ لە ئیسلام دا وا تەماشای ئافرەت دەکرێ کە هاوکوفی پیاوە و هاوتاو هاو وێنەی پیاوە ، وەك لە فەرمایشتێکی

---

٩- النساء ١ -

پێغەمبەردا(ﷺ) هاتوە:{إنما النساء شقائق الرجال}[10] واتە: بێگومان ئافرەتان لەتکی پیاوانن.

وەك چۆن سێوێك لەتك دەكرێ بە هەردووك لەتەكەی ئەو سێوە پێكدێنن، بە هەمان شێوە پیاو و ئافرەتیش بە هەردوو كیان خێزانێك پێكدێن، بە هەردوكیان مرۆڤێكی تەواو پێكدێنن،بە هەر دووكیان خێزانێك پێكدێنن و كۆمەڵگا پێكدێنن!

بۆیە هەرچی لەو بارەوە دەگوترێ كە گوایە ئیسلام بە سووك تەماشای ئافرەت دەكات و بە كەمتر لە پیاوی دادەنێ ئەسڵ و ئەساسی نیە،بەڵێ ئیسلام جیاوازی دەخاتە نێوان ئەركی پیاو و ئافرەتەوە،ئەو ئەركانەی كە پەیوەندی یان بە سروشتی نێرینەیی(ذكورة) ی پیاو، وە مێینەیی(أنوثة)ی ئافرەتەوە هەیە،ئەمەش پڕیەتی لە حیكمەت و عەینی حیكمەتە،چونكە وەك كوردەواری خۆمان دەڵێن {نان بۆ نانەوا و گۆشت بۆ قەساب}.

هەندێك ئەرك و كار هەن پەیوەستن بە پیاوەتی(رجولیة)ی مرۆڤەوە و هەندێكیشیان بە مێینایەتی(أنوثة)ی مرۆڤەوە و دەبێ پیاو ئافرەت تێیان دا جیاواز بن بۆ نموونە: ئەركی دایكایەتی هەر ئافرەت دەتوانێ بیبینێ و پیاو ناتوانێ دایك بێ، وەك هەندێك ئەركیش هەن كە پەیوەندی یان بە پیاوەوە هەیە وەك جەنگاوەریی كە دیارە زیاتر لەگەڵ سروشتی پیاودا دەگونجێ،بەڵام دیارە

---

١٠- رواه الامام لأحمد و أبو داود و الترمذي عن عائشة، و رواه البزار عن أنس(حديث صحيح)

کۆمەڵێك ئەرك و واجباتی زۆری هاوبەشیش هەن کە پەیوەندی یان بە مرۆڤایەتیی پیاو ئافرەتەوە هەیە، ئافرەت و پیاو تێیاندا یەکسانن،بۆ وێنە: هەر دووکیان دەبێ ئیمان بێنن، وە هەر دووکیان دەبێ کردەوەی چاك بکەن و بەندایەتیی بۆ خوا بکەن،وە دەبێ هاوکاریی یەکدی بکەن لەسەر مشوور خواردن لە کۆمەڵگا،یان لە بواری فەرمان بە چاکە کردن و ڕێ گرتن لە خراپە،ئەوانە پەیوەندی یان بە ماهییەتی ئینسانەوە هەیە،بۆیە پیاو و ئافرەت تێیاندا یەکسانن،بەڵام ئەو ئەرك و کارانەی کە پەیوەندی یان بە سروشتی ئافرەتایەتی یەوە هەیە یاخود بە سروشتی پیاوەتی یەوە هەیە شەریعەت جیاوازی خستۆتە نێوانیان، ئەویش وەك گوتم عەینی حیکمەت و لێزانینەو هەرشتە لە شوێنی شیاوی خوای دا دانانە.

## خاڵی چوارەم:تێڕوانینی ئیسلام بۆ خێزان:

ئایا ئیسلام چۆن تەماشای خێزان دەکات؟

خوشکە بەڕێزەکانم! ئیسلام وا تەماشای خێزان دەکات کە خێزان (أسرة) یەکەمین خشتی بنیاتنانی کۆمەڵگایە، دیارە هەر بینایەك کە دروست دەکرێ ئەگەر خشتەکانی ڕێك نەبن و باش لە قاڵب نەدرابن ئەو بینایە نارێك دەردەچێ،هەر بۆیەش ئیسلام زۆر گرنگی داوە بە خێزان، چۆن؟!لە ئیسلام دا قەدەغە کراوە کە ئافرەتێك و

پیاوێك بەیەكەوە كۆبنەوە مەگەر لەسەر بنەمای وشەی خوا وە بە شێوەیەكی شەرعی و ڕێك كە دوو شاهید هەبن و كۆمەڵگا پێی بزانێ،بۆچی؟! بۆ ئەوەی دوایی ئەو ئافرەت و پیاوە كە پێك دەگەن و نەسل و وەچەیان لێ پەیدا دەبێ،ئەو نەسل و وەچەیە باب و دایكی خۆیان بناسن،وە ئەو دایك و بابە بزانن ئەو مندالآنە هی كێن؟ دیارە خێزانێكی وا خێزانێكی ساغ و سەلامەتە،نەك ئەوەی كە ئێستا لە ولآتانی ڕۆژئاوا دا هەیە بە سەدان و بە هەزاران كوڕ و كچ هەن دەزانن دایكیان كێ یە بەلآم بابیان ناناسن!!

بەڵكو هەیە دایكیشی ناناسێ،چونكە بە شێوەیەكی ناشەرعی لە دایك بووە و یەكسەر دایكی بردوویەتی بۆ دایەنگا،نازانێ دایكیشی كێیە،بێگومان ئەوە حاڵەتێكی زۆر ناسەلیمە،جا ئیسلام وا تەماشای خێزان دەكات كە دەبێ خێزان لەسەر ئەساس و بنچینەیەكی ڕاست و دروست و گرێبەند(عقد)ێكی پیرۆز و موبارەك بنیات بنرێ، لەسەر بناغەی گرێبەندێك كە هەر دوولا ڕەزامەندی یان لەسەربێ و كەس و كاریشیان ئاگاداربن،وە كۆمەڵگا و دەوروبەریشیان ئاگاداربێ،بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:(أعلنوا النكاح)[11] واتە: هاوسەرگیریی ئاشكرا بكەن.

دیارە ئەوەش حورمەت و ڕێزی ئافرەت و پیاوەكەشی زیاتر تێدایە،وەهی منداڵەكانیشیان،وە بێگومان بە پێكهێنانی

---

[11]- رواه أحمد و الطبراني و ابن حبان عن الزبير، وهو حسن.

خێزانێکی ئاوا خشتێکی ساغ و سەلیم و ڕێک و پێکیش لەو کۆمەڵگایەدا دادەنرێ.

## تەوەرەی دووەم: **زیانەکانی دوورخستنەوەی ئافرەتان لە ئیسلام:**

کاتێك ئافرەت لە ئیسلام، لە دین وشەریعەتی خوا دوور دەخرێتەوە ، چ زیانێك دەکەین؟! ئایا ئافرەتەکە بە تەنها زیان دەکات؟! یان سەرجەم کۆمەڵگا زیان دەکات؟! با تەماشا بکەین:

١- جاریٚ ئافرەت- هەروەها پیاویش بەڵام لێرەدا کۆڕەکەمان بۆ خوشکانە و قسە دەربارەی ئافرەت دەکەین- کاتێك لە ئیسلام دوور دەخرێتەوە بەر لە هەموو شتێك لە ڕووی عەقیدەیی و فیکرییەوە زیان دەکات،بۆچی؟! چونکە تەنیا ئیسلام وەك دوایین دین و دوایین شەریعەتی دستکاری نەکراوی خوا(عزوجل) لەبەر دەستی مرۆڤایەتی دا ماوە و تەنیا ئەویش- وەك بەرنامەی ڕاست و تەواوی خوا- وەڵامی ڕاست و دروستی پێیە بۆ ئەو پرسیارە لە مێژینانەی کە لە مێشك و دڵی ئینساندا سەرهەڵدەدەن : ئایا من بۆچی دروست بووم؟ کێ دروستی کردووم؟ چۆن هاتووم؟ بۆکوێ دەچم؟پێویستە چی بکەم؟ چۆن بژیم ؟ ئەو پرسیارانە تەنیا ئیسلام بە شێوەیەکی ڕاست و دروست وەڵامیان دەداتەوە،ئەگەرنا هەرچی فەلسەفە و بیروباوەڕەکانی دیکەن تێکڕا تووشی سەرگەردانی و توشی گێژاو بوون لە کاتێك دا کە ویستوویانە وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەنەوە.

ئنجا کاتێك ئافرەتی موسڵمان لـە دینەکـەی دوور دەخرێتـەوە ئەوە لە ڕووی عەقیدەیی فیکریی یـەوە توشـی گیـژاو دەبێ،دیـارە عـەقیدە و فیـکریش بناغەیە و هەرکاتێك ئینسان نەیزانی شـوێنی لە (اعراب) ی بوون(وجـود)دا چی یە و،نەیزانی بۆ دروست بـووە و لە کوێ وەهاتوە و بۆ کوێ دەچێ و،دەبێ چۆن بژی و بەرنامەی چـی بێ و حەڵاڵ چی یە و حەرام چی یە و چاکە چی یـە و خراپـە چـی یە؟!

کاتێك ئینسان- واتە ئافرەتی موسڵمان — ئەو شتانەی نەزانی مانای وایە ژێربیناو بناغـەی ژینـی نیـە و بناغەیـەکی نیـە کـە لەسـەری بوەستێ،ئاشکراشـە کـە وەك چـۆن دیـوار بـێ بناغـە ناوەستێ،کەسێکیش کە(چ پیاو بێ چ ئافرەت) ئیمان و عەقیـدە و فیکری تەواو نەبێ، دیارە بەندایەتیشی بۆ خوا تەواو نابێ یان هەر نابێ،وەسەرەنجام کاتێك مرۆڤ پەیوەنـدیی لەگـەڵ خـوا(عزوجـل) دەپچرێ،لـە ڕووی خـوو و ڕەوشـت و هـەڵس و کـەوت و ڕەفتـار و ئاکاری کۆمەڵایەتیشەوە بە تەواوی تێك دەچێ.

٢- ئینجا با بزانین لە ڕووی خوو ڕەوشتەوە ئـافرەت بـۆ خـۆی،وە کۆمەڵگاش چ زیانێکدەکەن؟!

خوشکە بەڕێزەکانم! ئەگەر ئێمـە لەسـەر ئـەو بناغەیـەی کـە ئیسلام دایناوە بۆ تێڕوانینی ژیان و ئینـسان و ئـافرەت و خێـزان، تەماشای ئەو خووڕەوشت ئەدەبانە بکەین،کە ئیسلام دیاری کردوون

بـۆ ئـافرەت- زۆر جـار كـە باسـی خوورەوشـت و ئـەدەب دەكـرێ
خەڵكانێك تەنیا زەینیان بەلای بەرگ و پۆشاكی ئافرەتان دا دەچێ
بەڵام لە ڕاستی دا بەرگ و پۆشاك بەشێكە لەو خوورەوشـتەی كـە
ئیسلام دیاری كردوە بۆ ئافرەتی مسوڵمان و بەشێكە لـەو ئەدەبـە
بەرزانەی كە دیـاری كـردوون بـۆ ئـافرەتی موسـڵمان بـۆ ئـەوەی
كەسایەتی و حورمـەت و ڕێـزی پارێزراوبێ،ئەگـەرنا لەڕاسـتی دا
پۆشاك دەوری توێكڵ دەبینێ- ئەو كاتە وەك پێویست لە حیكمەت
و فەلـسەفەكەیان تێدەگەین،چـونكە لـە ڕاسـتی دا شـەریعەت
هەڵقوڵاوی عەقیدە و جیهانبینی یەو، وەك دیوارێك لەسەری بنیات
نراوە و بەبێ لێتێگەشتنی عەقیدە لە نهێنـی یـەكانی شـەریعەت
تێناگـەین و بـەبێ عـەقیـدەش بـە شـەریعەتەوە پابەنـد نـابین،بۆ
نموونە:ئیسلام بەر لەوەی بە ئافرەتی موسـڵمان بڵـێ: دەبـێ خـۆت
بپۆشی و لە نێو كۆمەڵگا و خەڵك دا بە حەیاو حورمەت بی، پێی
دەڵێ: دەبێ خاوەنی شەرم و شكۆبی بەرامبەر بە خوا(جـل شـأنه)
چـونكە بڕوابـوون بـە خـوا و خۆشویـستنی و لێترسـانی و شـەرم
لێكردنی وا لە مرۆڤدەكات كە بە شەرم و شـكۆبێ بەرامبـەر بـە
پێكهاتەكانی كۆمەڵگاوە بەرامبەر بە دایك و باب، بەرامبەر بـە
پیـاوان و بەرامبـەر بـە ئافرەتـان، و لـە ڕاسـتی دا شـەرم و
شكۆ(الحیاء) سیفەتێكی ڕیشەیی یە لە هەموو ئینسانێك دا بەڵام
لە ئافرەتاندا زیاترە،بۆیە لە كاتێكدا كە ئافرەت وای لێ دەكرێ كە
شەرمی نەمێنێ- لەگـەڵ ڕێـزم بـۆ خوشـكانی بـەڕێزم- كاتێـك

ئافرەت وای لێدەکرێ کە شەرمی نەمێنێ، لە حەقیقەت دا ڕێکەی لەبەردەم دا ئاچووخ دەبێ بۆ هەر جۆرە هەڵدێرانێکی دیکە.وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ{ان مما أدرك الناس من كلام النبوة الأولى اذا لم تستح فاصنع ماشئت[١٢]} واتە: یەکێك لەو شتانەی کە خەڵك لە قسەی پێغەمبەرانی پێشوو بۆی ماوەتەوە ئەوەیە کە ئەگەر شەرمت نەکرد هەرچی دەیکەی بیکە.

بەڵێ شەرم و شکۆ بەو شێوەیەی کە ئیسلام دەیڵێ بێگومان خەسڵەت و سیفەتێکی زۆر گەورەیە و پەردە و پەرژینێکە کە مرۆڤەلە هەموو شتێکی خراپ و ناشیرین دەگێڕێتەوە و دەیپارێزێ .

جا من زۆرم پێ سەیرە کە لە دام و دەزگاکانی ڕاگەیاندنی لای خۆمان- واتە هی تەوژمی عەلمانی لیبراڵی- هەوڵدەدرێ ئافرەتانی ئێمە شەرم و شکۆیان نەمێنێ! لە تەلەفزیۆن و کەناڵەکانی ڕاگەیاندنیاندا زۆر بە ڕاشکاویی و بێ پەردە باس لەوە دەکرێ چۆن کوڕ و کچ پێکەوە دڵداری بکەن.وەك بڵێی کە ئەگەر عەلمانی یەکان کچ و کوڕەکانی کورد فێری دڵداری و خۆشەویستی نەکەن،نەزانن یەکتریان خۆش بوێ!! لە حاڵێك دا کە یەکتر خۆشویستنی پیاو و ئافرەت ئەو کێش کردنە غەریزی و سروشتی یەی کە لە نێوانی نێرومێ دایە پێویستی بە

---

١٢- رواه الامام أحمد و البخاري وابوداود و ابن ماجه عن ابن مسعود

فێرکردن ناکات و لەوەتی خوای بەدیهێنەر ئادەم و حەووای لەسەر زەوی داناون و کردوونی بە هاوسەری یەکتر، پیاوان و ئافرەتان هەر زانیویانە یەکدی یان خۆش بوێ و یەکدی خۆشویستنی نێرومێ علیم و صنعەتێك نیە نەزانرێ،بەلام گرنگ ئەوەیە ئێمە خەلك فێری ئەو ئەدەب و رەوشتە بەرزانە بکەین کە بە شێوەیەکی وایەکتریان خۆش بوێ و بە شێوەیەکی وا خێزان پێکەوە بنێن و بە شێوەیەکی وا چاویان لەوەبێ کە پێك بگەن کە خەجالەت بارو روو زەرد و شەرمەندەی دنیا و دوا رۆژ نەبن،ئائەوە گرنگە،[13] هەروەها یەکی دیکە لەو ئەدەب و بەها جوان و رەشتە بەرزانەی کە ئیسلام فێری ئافرەتی مسولمانی دەکات, وە فێری ئینسانی دەکات بە گشتی بە پیاوو ئافرەتەوە ئەوەیە کە تەنیا لە چوارچێوەی غەریزەکانی خۆیدا نەژی, بۆچی ؟! چونکە ئایا ئینسان بەچی لە ئاژەل جیا دەبێتەوە؟! دیارە بەوە کە ئاژەل تەنیا بیر لە غەریزەکانی خۆی دەکاتەوە و تەنیا دەزانێ بخواو بخواتەوەو بلەوەرێ و بخەوێ وجووت بێ، بەلام ئینسان ئاژەل نیە، ئینسان دروستکراوێکی بەرزو بەرێزەو عەقلی هەیە ، دل ودەروونی هەیە وهەست ونەستی

-----

١٣- کە بە داخەوە راگەیاندنی تەوژمی عەلمانی هەر بەلای دا ناچێ و هەر سەرگەرمی و ورژاندنی غەریزەی جینسی گەنجانە، بێ ئەوەی رێگا چارەسەرێکی راست و دروست بۆ تێرکردن و دامرکاندنی ئەو هەست و غەریزە ورووژێنراوەی گەنج و لاوان بکاتەوە کە لە گوناهباریی و عەیبداریی بیانپارێزێ!

هەیە, ئینسان بۆ تاقیکردنەوە و هەڵسەنگێندران دروستکراوەو ئەرکێکی گەورەی پێ سپێردراوە.

بۆیە ئیسلام بە ئافرەت دەڵێ : تۆ نابێ تەنیا مەحکوومی غەریزەکانی خۆت بی، وەك ئاژەڵ چۆن شەکەت دراوە بە غەریزەکانی خۆیەوە ونـاتوانێ لێیـان لابـدات، بـەڵام ئینسان دەتوانێ وەك ئاژەڵ نەژی بەڵکو دەتوانێ وەك ئینسان بـژی و غەریزەکانی خۆشی تێر بکات بەو شێوەیەی کە شەرعی خـوا دیاری کردوە تا بە زەرەرو زیان نەشکێتەوە بەسەر بەرژەوەندیی یەکانی خۆی و خێزان و کۆمەڵگا و دنیا و دوا ڕۆژی دا و بـۆی بە زیانی جەستە و ڕۆح و عەقڵ و نەفسی تەواو نەبێ!

هەروەها یەکی دیکە لەو ڕەوشت و ئەدەب و ئاکارە بەرزانەی کە وەك گوتم لە بواری ڕەوشت و ئەدەب دا ئیسلام بـۆ ئافرەتانی داناوە بریتییە لە بەرگ و پۆشاك، جا ئەگەر ئێمە بـە شێوەیەکی مەنتیقی یانە و بابەتی یانە تەماشای بـەرگ و پۆشاکێك بکەین کە ئیسلام بـۆ ئـافرەتی دانـاوە، وە بـەرگ و پۆشاکێك کە لە سایەی غەیری ئیسلام دا ئافرەتان دەیپۆشن، چی دەبینین؟!

ئافرەتی موسڵمان کاتێك بەرگ و پۆشاکی شەرعی دەپۆشێ وەك ئینسانێك دێتە بەر چاو،بەڵام- ئێوە هەموو خوشکی بـەڕێزن- ئەو بەرگ و پۆشاکانەی کە خەڵکی ناموسڵمان دەیانەوێ ئـافرەتی موسڵمانی کورد بیانکاتە بەری،ئایا ئەو ئافرەتانە کاتێك کە لـە

بەری دەکەن وەك ئینسانێك،یا خود وەك مێینەیەك دێنە بەرچاو؟!
ئیسلام دەیەوێ ئافرەت کەسایەتیی پارێزراو بێ،کاتێك بەرێ دا دەڕوا وەك ئینسانێك بێتە بەرچاو،نەك مێینایەتیی خۆی بەرجەستە بکات بە شێوەیەك کە ڕان و بەلەکی دەربخات و لەش و لاری دەرخات و مێینایەتی(أنوثة)ی تێدا دەربکەوێ و تەجسیم بێ!!

بەڕاستی من هەندێ لە ئافرەتان دەبینم زۆر پێ سەیرە چۆن پێیان شەرم نیە بەرێ دا بڕۆن و بەسەر جادە و شەقامەکاندا بێن و بچن،کە شێوە بەرگێکیان لەبەر کردوە هەموو ئەندامەکانیانی تێدا بەرجەستە بووە،کە بێگومان ئەوە زۆر شتێکی ناشیرینە،جا ئیسلام بۆیە ئەو بەرگ و پۆشاکەی بۆ ئافرەت داناوە تاکو کەسایەتی و کەرامەتی پارێزراوبێ،بۆیە بەرگ و پۆشاکی شەرعی یانەی ئافرەت بە شێکە لە خوو ڕەوشتی بەرز و جوانی ئینسانی موسڵمان، چ پیاو چ ئافرەت خوو ڕەوشتی بەرزی مسولمانیش بەشێکە لە موسڵمانەتی یەکەی،بگرە بەڵگەی ئیمان و مسوڵمانەتی یەتی وەك پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (أن من خيارکم أحسنکم أخلاقا) رواه البخاري و مسلم عن عبدالله بن عمرو بن العاص.

٣- ئینجا ئایا لە ڕووی خێزانی یەوە لە کاتێکدا کە ئافرەتی مسوڵمان لە ئیسلام دوور دەکەوێتەوە،ئەو دوور خستنەوەیە لەڕووی خێزانی یەوە چ زیانێك دەگەیەنێ؟! ئێستا ئێوە دەبیستن کە زۆر

کێشه و گرفتی گەورەی خێزانی هەن له نێو کۆمەڵگاکەماندا، که یەکێکیان بریتیه له ناپاکیی ژن و مێردایەتی{الخیانة الزوجیة} وە یەکی دیکەیان بریتیه له گیرۆدەبوونی ژمارەیەك له کوڕان و کچان به زینا و داوێن پیسی یەوە، که وێڕای گوناهباریی دوارِۆژ، عەیبداریی و سەرشۆڕی یەکی گەورەش دێننه سەر خۆیان و کەس و کارو خێزانەکانیشیان!

بەڵێ خوشکەکانم! بێگومان ئێمه چەندان دەرد و گرفت و کێشەی خێزانی مان بۆ دروست دەبن به هۆی دوور کەوتنەوەی ئافرەتانەوە له ئیسلام و بەدەم ڕەشەبا و گێژەڵووکەی عەلمانییەت و لیبرالیزم و بەرهەڵدایی یەوە چوونیانەوە.

وە شەریعەتی ئیسلام باوەشێکی گەرمه و قەڵایەکی مەحکەمه و ئافرەتی مسوڵمان دەپارێزێ،ئەخلاق و کەسایەتیی دەپارێزێ،بەڵام کاتێك له ئیسلام دوور دەخرێتەوە له ڕاستی دا خۆی و خێزانەکەیشی بەدبەخت و چارەڕەش دەبن، لێرە به پێویستی نازانم وێنەتان بۆ بێنمەوە چونکه بۆ خۆتان ڕۆژنامەکان دەخوێننەوە و له ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و کەناڵەکانی ڕاگەیاندن دەبینن و دەبیستن،که زۆرێکیش لەو شتانه پەنهان دەکرێن و کپ دەکرێنەوە و بێ دەنگه و دیزە بەدەر خۆنەیان لێ دەکرێ،ئەگەرنا ئەو شتانەی که دەکرێن و ئەو کارەساتانەی که لەو بوارەدا ڕوو دەدەن که هەندێك جار هەندێك له ڕۆژنامه و بڵاوکراوەکان تەنیا سووچێکیان لێ دەردەخەن،ئەگەر هەموویان دەربخرێن ئەو جار دەزانین که کارێکی

زۆر خراپ دەکرێ دەرحەق بە کۆمەڵگای کوردەواری و ئەو ڕەسەنایەتی یەی لەسەری بووە،کاتێک دەویسترێ ژنان و کچانی کوردستان لە ئیسلام دووربخرێنەوە!-ئێوەش خوشکی بەڕێزن- کاتێك کە هەر کچە و لە ماڵی بابی دایە بەڵام کچ نامێنێ،دوایی ئەو کچە فریو دراو و داماو و لە خشتە براوە هەر خۆی بەدەست خۆیەوە گیر دەخوات،باب و دایکی بەدەستی یەوە گیر دەخۆن کە چۆنی بەشوو بدەن و چۆن چۆنی شووبکات! چونکە کۆمەڵگای ئێمە کۆمەڵگایەکی مسوڵمانەو ئەو فەساد و بێ نامووسیی و بەرهەڵدایەتی یە قبوڵ ناکات!

لە ڕۆژئاوا تا وای لێهاتوە ئافرەت ئەگەر کچ نەمێنێ بەلایانەوە گرنگ نەبێ،کاری زۆری بۆ کراوە و هەر لە ئەسڵیش دا کۆمەڵگای ڕۆژئاوا کۆمەڵگایەکی ماددی و ئاژەڵیی بووە،بۆیە ئەوەی کە دەویسترێ لە کوردستانی ئێمەدا پیادە بکرێ،لە ڕاستی دا ئەوە کاتێك دەکرێ کە خەڵکی کوردستان مسوڵمان نەمێنێ و پیاوان غیرەتیان نەمێنێ،بۆیەش من لێرەوە ڕایدەگەیەنم کە بێگومان کەم شەرمیی ئافرەتان بەرهەمی بێ غیرەتی پیاوانە و هەتا پیاوان غیرەتیان کەم نەبێتەوە ئافرەتان شەرمیان کەم نابێ،ئەو شەرمەی کە دەیانگێڕێتەوە لە گوناح و دەیانپارێزێ لەوەی کە کەسایەتیی یان برووخێ و لەکەداربێ،وە گیرۆدەی سەرشۆڕیی و بەدبەختی و چارەڕەشی بن!

٤- وه له ڕووی کۆمەڵایەتی یەوە ئایا کۆمەڵگایەك کە ئافرەتەکانی هەر خەریکی دەست بە خۆداهێنان بن و هەمیشە سەرگەرمی خۆڕازاندنەوە بن و بە هەموو شێوەیەك سەرقاڵی ورووژاندنی غەریزەی جینسیپیاوان و سەرنج ڕاکێشانیان بن،ئایا ئەو کۆمەڵگایە بە کۆمەڵگایەکی ساغ و سەلیم دادەنرێ؟!

زۆر جار ئافرەتانی ڕۆژئاوایی دێن چاوپێکەوتنمان لەگەڵدا دەکەن،وە لە چەندان بۆنەدا دەیانبینین ئەو حاڵەتەی کە لە هەندێك لە ئافرەتانی خۆماندا دەیبینم – واتە ئافرەتانی کوردەواری و ئافرەتانێك کە لە ئیسلام دوور خراونەتەوە – لە ئافرەتانی ڕۆژئاوایی و بیانی دا نایبینم،ئەوان چەندان جار هاتوون چاوپێکەوتن و دیداریان لەگەڵدا ساز داوین و لەگەڵمان دانیشتوون ئەوەی کە لە هەندێك لە ئافرەتانی کوردەواریی دەبینرێ لە میکیاج کردن و خۆڕازاندنەوەی بێ تام و بەرگ و پۆشاکی تەسك و ترووسك لەبەرکردن، لەوانم نەبینیوە و وەك مرۆڤێکی عادەتی هاتوونە بەرچاو،بەڵێ بەرگ و پۆشاکی ئیسلامی یان لەبەر نەکردوە بەڵام زیادەڕۆیی شیان نەکردوە لەو شتانەی دیکەدا.

ئینجا بەڕاستی کۆمەڵگایەك ئافرەتانی هەر خەریکی ئەوە بن کە چۆن سەرنجی پیاوان ڕابکێشن و چۆن مێیینایەتیی خۆیان نمایش بکەن و بە چەندان شێواز سەرنجیان ڕاکێشن و غەریزەیان بجوولێنن،بەڕاستی ئەو کۆمەڵگایە کۆمەڵگایەکی

نەخۆشە ،وە گەنجەکانیش- کوڕەکان — لە ئاکامی ئەو ڕەفتارەی ئافرەتاندا تووشی زۆر هەڵەو پەڵە بوون و دەبن ،ئێستا زۆر لە ڕۆژنامەکان دەنووسن کە ئافرەتان سکاڵا دەکەن و دەڵێن: گەنجەکان دەستمان بۆ دێنن و توانج و پلارمان تێدەگرن و...هتد ،دەی ئەگەر ئەو ئافرەتە بەو شێوەیە مێیینایەتیی خۆی دەرنەخات و خۆی ئاوا نمایش نەکات و غەریزەی پیاوان نەجوولێنێ ،دیارە گەنجەکانیش بەو شێوەیە ناکەن، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی:﴿وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا... ﴾[14] واتە: وە سزاو تۆڵەی خراپە خراپەیەکی وەك خۆیەتی.

هەڵبەتە من لێرە پاساو بۆ ڕەفتاری دزێوی گەنجان[15] ناهێنمەوە چونکە بێگومان ئەوەی ئەوانیش هەر ناشەرعی یە ،بەڵام مەبەستم ئەوەیە کە ئەو دیاردەیە و ڕەفتارە ناشەرعی یانە پێکەوە پەیوەستن،کەواتە لە ڕووی کۆمەڵایەتی یەوە دوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام دەبێتە هۆی نەخۆشبوونی کۆمەڵگا و یەکێك لە نەخۆشی یەکانیش تێدا وروژێنرانی غەریزەی جینسی یە ،ئینجا ئەویش لە کاتێکدا کەمەسەلەی خێزان پێکەوە نان و هاوسەرگیری بەزەحمەت خراوە و ئەویش وەك بلێی ئیشی لەسەر دەکرێ کە کەم بکرێتەوە یان زۆر دوا بخرێت!!

---

١٥- الشورى — ٤٠-

١٦- واتە ئەو جۆرە گەنج و لاوانەی ئەو ڕەفتارە دزێوانەیان لێ دەپشکوێتەوە.

تەماشای دەکەین لە کۆمەڵگای ئێمەدا چەندان قەیرە کچ هەن،کچان قەیرە دەبن و دەکەونە تەمەنەوە لە سۆنگەی سارد بوونەوەی گەنجانەوە لە مەسەلەی ژنهێنان و هاوسەرگیریی دا،وە لە ئاکامی سەری خۆ هەڵگرتن و ڕووکردنە هەندەرانیان دا،کە لەوێش زۆربەیان سەلامەت دەرناچن گیرۆدەی چەندان گرفت و کێشە و لاساریی و لادان و نەخۆشی دەبن.

٥- ئنجا لە ڕووی ئابوورییەوە، کاتێك ئافرەت لە ئیسلام دوور دەخرێتەوە زیان و زەرەرێکی دیکە کە لە خۆی و خێزانی و کۆمەڵگاکەی دەدات لە ڕووی ئابورییەوە و لە ڕووی ژیان و گوزرانەوە ، بۆچی؟! چونکە ئەو ئافرەتەی کە هەموو خولیا و مەبەستی ئەوەیە خۆی بۆ پیاوان نمایش بکات و هەر ڕۆژە بە جۆرێك و بەرەنگێك بێتە بەر نیگایان،وە پشوو سوارانە ڕاکە ڕاکیەتی بە دوای مۆدێلە جۆراوجۆراکاندا، ناچارە مەسرەفێکی زۆر بکات و بارێکی ئابووری قورس دەخاتە سەر گیرفانی بابی یان مێردی یان خۆی! بێ ئەوەی کە هیچ بەرهەمێکی دەست بکەوێت بێجگە لە جوولاندنی غەریزەی پیاوان، کە غەریزەیان دەجوولێنێ و دەورووژێنێ،وە دیارە خۆیشی بەهۆی خۆڕانواندن و خۆڕازاندنەوە وە سووك و بێ نموود دەکات و خۆی لە پێش چاوی پیاوان دەبێزێنێ، چونکە بۆ دڵنیایی خوشکانی بەڕێزیشمان پیاوانیش زیاتر دڵیان بەلای ئافرەتێکدا دەچێت کە (دیارە ئەو پیاوەی بە جددی بیەوێ خێزان پێکەوە بنێ) کە خاوەنی

کەسایەتی و کەرامەت بێت و چاوی لەوە بێ کە بە تەنیا حەلاڵی پیاوێك بێ، بەڵێ هەرکەسێك بیەوێ ژن بێنێ، مەگەر چۆن دەنا ئافرەتێکی ناوێ کە هەمیشە خەریکی خۆڕازاندنەوە و خۆڕانواندن و خەریکی جوولاندنی غەریزەی پیاوان بێ!

پیاو سرووشتی وایە پێی خۆشە هاوسەرێکی هەبێ زۆر وەفادار و بە ئەمەك بێ و بێجگە لەو چاوی لە کەسی دیکە نەبێ، هاوسەرێك کە بە کەڵکی دایکایەتی بێ و بۆ ئەوە شایستە بێ کە ببێ بە دایکی منداڵ و جگەرگۆشەکانی!.

٦-ئنجا لە کۆتاییدا لە رووی سەرنجام و چارەنووسەوە، ئایا ئەو خوشکانەمان کە تووشی بێ بەتدو باریی و رەوشت داڕووخان و تووشی چەندان غەڵەت و پەڵەت دێن هەرخۆشیان بە مسوڵمان دەزانن!

دەی باشە خوشکەکەی من،خۆ تۆ دەبێ بزانی کە قیامەت و دوا رۆژێك هەیە و سزاو پاداشتێك هەیە و لێپرسینەوەت لە گەڵدادەکرێ، باشە نابێ تۆ بزانی کە سەرنجام و چارەنووسێك چاوەڕێت دەکات؟!

پاشان ئەو کەسەی کە دەیەوێ ئافرەت لە ئیسلام و شەریعەت و ئەدەب و رەوشتەکەی دوور بخاتەوە، پێی دەڵێین:باشە کاکە تۆ ئەگەر خۆت بە مسوڵمان دەزانی و دەشزانی گەلەکەمان مسوڵمانە،دەبێ قەناعەت و بڕوات وابێ و دڵنیابی کە ئینسان کاتێك کە لە ئیسلام دوور دەکەوێتەوە،

تووشــی ســزاو جەزرەبــەی خوایتۆڵەســتێن دەبــێ و ڕۆژڕەشــیی دوارۆژچاوەڕێی دەبــێ, ئــەدی نــابێ تــۆ دڵــسۆزی ئــەو خــەڵك ومیللەتەبی و نابێ بەتەنگ چارەنووس و دوارۆژییەوە بی؟!

## تەوەرەی سێیەم

## پاساوو بیانووی دوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام:

ئێستاش بابزانین پاســاوو بیــانووی دوورخــستنەوەی ئــافرەت لەئیسلام چی یە؟!

لەو بارەوە هەندێك شت یاس دەكرێ، بۆ وێنە: دەگوترێ: بــە مەبەســتی بەرەوپێشــچوونی كۆمــەڵگاكــەمان و پێــشكەوتنی ئافرەتان،پێویستە ئافرەتان لە ئیسلام دوور بكەونــەوە لــە ڕووی فیكرییانەوە لە ڕووی هەڵسوكەوت و ڕەوشتیانەوە، لە هــەموو لایەنەكانەوە دەبێ ئافرەتان لە ئیسلام دوور بخرێنەوە تاكو پــێش بكــەون، یــاخود دەڵــێن: ئــەوە پێویــستە چــونكەمرۆڤ دەبــێ ئازادبێ،ئافرەت بۆ ئەوەی ئازادبێ دەبــێ ئــەو قەیــد و بەندانــە بشكێنرێن كە دەبنــە ئاســتەنگ و بەربەســت لــە ڕێــی بــەرە و پێشچوونی ئافرەت دا ،یان دەڵێن:ئافرەت بــۆ ئــەوەی مافــەكانی خۆی وەدەست بێنێ دەبێ ئەو قەید و بەندانە بــشكێنێ،واتە لــە

شیرازه و سنووری شەریعەت دەربچێ،یاخود بە پاساوی ئەوەی کە کۆمەڵگایەکەمان کۆمەڵگایەکی دواکەوتوویە و زۆر جار بەناوی ئیسلامەوە ستەم لە ئافرەت کراوە،بۆ نموونە:کچ بە زۆر بە شوودراوە،یان بە گچکەیی مارە کراوە،یان چی و چی کراوە،بۆیە دەبێ ئێمە لە رقی ئەوە واز لە ئیسلام بێنین!!

بەڵام لە ڕاستی دا هەموو ئەو بیانوو پاساوانە شتی بێ جێن:

یەکەم: خوشکانی من! ئیسلام ڕێی لە پێشکەوتنی نەگرتوە،بەڵکو ئیسلام لەسەر ئێمەی فەرز کردوە کەچی خەڵك هەیەتی لە زانست و زانیاری و صەنعەت و لەشتی باش و پەسند و سوودبەخش لێیان وەربگرین و لێیانەوە فێربین،وەك خوا(جل شأنه) فەرموویەتی:﴿الذين يستمعون القول فيتبعون أحسنه...[16]﴾ پێغەمبەری خوایش(ﷺ) فەرموویەتی: {الحكمة ضالة المؤمن فحيثما وجدها فهو أحق بها[17]}واتە: زانیاری شتێکە لە بڕوادار ون بووە جا لەهەر شوێنێك چنگی بکەوێ لە هەموو کەس پێی شایستەترە،وە فەرموویەتی: {طلب العلم فريضة على كل مسلم[18]} واتە: بەدوای زانیاری دا گەڕان لەسەر هەموو مسوڵمانێکی نێرومێ فەرزە.بەڵام ئیسلام لێی قەدەغە کردووین

---

16- الزمر-18-

17 رواه الترمذي

18- رواه أبن ماجه عن أنس

که شتی پڕو پووچ و ڕەوشتە خراپـەکانیان لێ وەربگرین،ئەگـەرنا ئیسلام دەڵێ:ئەگەر خەڵك زانست و پیشەسازیی هەیە و لـەڕووی تەکنۆلۆژیاوە پێشکەوتووە،ئەگەر لـە ڕووی ئیـداریی و سیاسـی یەوە پێشکەوتووە،تۆ ئەزموون(تجروبە)ی ئەوان وەربگـرە و لێیـان سوودمەند ببە،کە واتە: بۆ ئەوەی ئێمـە ژیانمـان بـەرەو پێـشەوە بەرین،خوشکانمان بۆ ئەوەی گەشـە بکـەن و بـەرە و پـێش بـچن پەکیان لەسەر ئەوە نەکەوتوە واز لە دینەکەیان بێنن.لە حاڵێـك دا کە دینەکەیان فـەرمانیان پـێ دەکـات، فـەرمان بـە مرۆڤـ دەکـات کـە هەمیـشە لەبـەرە و پێشـچوون و گەشـەکردندابێ هەمیـــشە هەوڵبـــدات وولاتـــی خـــۆی زیـــاتر بەرەوپێـــشەوە بەرێ،هەوڵبـــدات شـــارەزاتربێ،خۆ ئێمـــە زۆرمـــان پێخوشـــە خوشکانمان لە ڕووی فێربوونی زانـست و پیـشەسازی و ئیـداریی یەوە چاو لە خـەڵکی ڕۆژئـاوا بکەن،کـە بێگومـان ئـەوان لـەو ڕووانەوە پێشکەوتوون،بەڵام ئێمە پێمـان ناخۆشـە لـە وشـتانەدا تەماشایان بکەین و لاسـایان بکەینـەوە کـە دەرد و نەخۆشـین و ڕۆژئاوایی یەکان بۆ خۆشیان پێیانەوە گیرۆدە بوون،با ئێمە چاو لە خەڵك بکەین لە شتی باش دا و لاسایان نەکەینەوە لەشتی خراپ دا.

دووەم :ئینجا مەسەلەی ئازادی،لەڕاستی دا ئەوەندەی کە ئیسلام داکـۆکیی کـردوە،لەسـەر ئـەوە کـە ئینـسان ئازادبـێ- بـەپیاو و ئافرەتەوە- هیچ بەرنامەیەك ئەوەندە داکـۆکیی نـەکردوە، بۆچـی؟!

چونکە لە ئەسڵدا ئیسلام دەڵێ: مرۆڤەکان هەموویان ئازاد خولْقێنراون و دەبێ تەنیا بەندەی خوابن،نابێ هیچ کەسێك کەسێکی دیکە بچەوسێنێتەوە و زوڵم و ستەمی لێ بکات،چونکە هەموویان وەك یەك بەندە(عبد)ی خوان و هەمووشیان بۆ تاقی کردنەوە خولْقێنراون،بەڵێ لە ڕاستی دا ئیسلام بۆ ئەوە هاتوە کە مرۆڤەکان ئازاد بن،بەلاّم ئایا ئەو ئافرەتەی کە لە ئیسلام دوور دەخرێتەوە و هەر ڕۆژەی بە جۆرێك یاریی پێ دەکرێ،ئایا ئەو ئافرەتە دەتوانێ بڵێ: من ئازادم؟! ئایا نەکراوە بە کۆیلەی عادەت و مۆدێل؟! نەکراوە بە کۆیلەی ئارەزوو و داخوازی یەکانی ئەو کەسانەی کە ئەو دام و دەزگای ڕاگەیاندنە یان بە دەستەوەیە و هەر جارە ڕەواج بە شتێك دەدەن؟!

بێگومان ئەو ئافرەتانەی ئەوە حالّیانە ئازادیی یان لە دەست داوە،ئەو ئافرەتەش ئازادە کە بەپێی ئیمان و عەقیدە و دینی خۆی و بەو شێوەیە کە کەسایەتیی و کەرامەت و ئابڕووی پارێزراو بێ ئاوا هەڵس و کەوت دەکات،نەك ئەوەی کە هەرجارە بە مۆدێلێك و بە شوێنێك دا دەیبەن و هەرجارە بەشێوەیەك دەیڕازێننەوە و ڕەوشتێکی نزم و ناپەسەندی فێر دەکەن! ئەو ئافرەتە کۆیلەیە خاوەنی ئیرادەی خۆی نیە و لە ژێر کاریگەریی غەریزەی خۆی دایە نەك عەقڵ و دینی!

سێیەم: ئنجا دەربارەی مافی ئافرەت، ئایا ئافرەت بۆ ئەوەی مافەکانی بۆ دابین بکرێت پەکی لەسەر ئەوە کەوتوە کە لە دین و شەریعەت و بەرنامەی خوا دوور بکەوێتەوە؟!

خوشکانی من! لە ئەوروپا و ڕۆژئاوا بەگشتی بە ئەمریکاشەوە کاتێك ئافرەتان بە هەندێك لە مافەکانی خۆیان گەیشتن و دەستیان لێیان گیربوو،کە چەندان هەوڵ و تەقەللایان داو چەندان خۆپیشاندانیان بەرپاکرد،وە لەسەر ئەوە باجی زۆریشیان دا ئنجا هەندێك لە مافەکانیان دەستکەوت! بەڵام پێش ئەوەی یەك ئافرەت خۆپیشاندان بکات و نارەزایی دەرببڕێ شەریعەتی خوای کاربەجێ مافی تەواوی بە ئافرەتان دا، بۆچی؟ چونکە خوای بەدیهێنەر خوای هەموو لایەکە،زۆر سەیرە ئەوەی کە دەگوترێ باوك سالاریی و دایك سالاریی و پیاو سالاریی...هتد،لە ئیسلام دا تەنیا شەریعەت سالاریی هەیە و شەریعەتی خوا سەروەر و سالاری هەموو کەسە! ئەگەرنا نەپیاو کوێخای ئافرەتە و نەئافرەتیش کوێخای پیاوە،لە ئیسلامدا شەریعەتی خوا حاکمە و بڕیار دەدات کە ئەوە حەق و مافی پیاوە و ئەویش هی ئافرەت،ئەویش ئەرکی هەرکامیانە بەرامبەر بەیەکدی،وە دەبێ ڕێزی زۆریش لەیەکدی بگرن،هەردووکیان هەر مرۆڤن،هیچ کامیان لەوی دیکە گەورەتر و بەرێزتر نیە مەگەر پارێزکاریی(تقوى)ی زیاتربێ!

وە لە ڕاستی دا مەسەلەی باوك سالاریی و دایك سالاری پیاو سالاریی و ئافرەت سالاریی لە ئیسلام دا وجودی نیە شەریعەتی

خوای مەزن سالار و سەروەرە بەسەر هەموو لایەکەوە،شەریعەتی خواش (نێر) داینەناوە تاکو بەزەرەری مێ تەواو بێ و،(مێ) داینەناوە تاکو بەزەرەری نێر تەواوبێ،خوایەك(جل شأنە) دایناوە کە نێرایەتیی و مێیایەتی پاڵ نادرێتەلا،خوای بەدیهێنەر دەفەرموێ:﴿وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴾ الذاريات- ٤٩- ئەوە قاعیدە و یاسای خوایە بۆ دروستکراوانی خۆی،بەلاّم خوای بێ وێنە و هاوەڵ لەسەرووی ئەوەوەیە کە نێرایەتیی و مێیایەتیی پاڵبدرێتەلا،بۆیە شەریعەت و بەرنامەکەی نە بەلای پیاو دا شکاوەتەوە نە بەلای ئافرەت دا، بەڵکو بۆ هەردووکیان وەك یەکە.

ئنجا ئەگەر بە ئینسافەوە تەماشای مافەکانی ئافرەت بکرێت لە شەریعەتی خوادا هەموو مافەکانی بۆ دابین کراوە، مافی سیاسیی،فیکری،ئابووری،کۆمەڵایەتی،...هتد،دیارە لێرەدا دەرفەتی ئەوەمان نیە هەمووی باس بکەین[19].

چوارەم: ئنجا کاردانەوە،ئایا لە کاردانەوەی هەندێك عادەت و نەریتی هەڵەی کۆمەڵگادا دەبێ ئێمە واز لە دینی خوا بێنین؟!

ئافرەت کە بە گچکەیی مارە کراوە،یان کە بە نابەدڵیی خۆی بەشوو دەدرێ،یان کە ژن بە ژنی پێدەکرێ،یان کە دەهێڵدرێتەوە و بەدڵ خواستی خۆی بەشوو نادرێ،یان کە بابی دەیەوێ بەزۆر بیدا

---

٢٠- لە کتێبی (ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەت دا) باسم کردوە چۆن لەشەریعەتی خوادا هەموو ئەو مافانەی کە پیاو هەیەتی لە کۆمەڵگادا ئافرەتیش هەیەتی،بەلاّم بە لەبەر چاوگرتنی سروشتی ئافرەتانەی،بڕوانە:لاپەر:٩٥ تا ١٢٨،چاپی دووەم نووسینگەی تەفسیر.

به خزمێکی خۆی و...هتد، ئەوانـە هـەموویان عـادەت و نـەریتی نەفامی (جاهلي)ن, و هیچ پەیوەندی یان بە شەریعەتی خواوە نیە, لە شەریعەتی خوای دادگەردا ئافرەتیش وەك پیاوە، وەك چۆن پیـاو بە ویست و ئارەزووی خـۆی ئـافرەت دیـاری دەکـات، بـە هـەمان شێوەش ئافرەت دەبێ بە ویـست وئـارەزووی خـۆی، بـە ڕەغبـەت و ئیرادەی خۆی هاوسەری ژیانی خۆی دیاری بکات! ئەگـەر بەلایـەوە پەسند و گونجاو نەبێ هیچ کەس بۆی نیە لەسەری فەرز بکات.

لەو بارەشەوە زۆربەی هەرە زۆری زانایانی ئیسلام دەڵێن: هـەر گرێبەند(عقد)ێکی هاوسەرێتی بە زۆرلێکردن(جـبر)ی ئافرەتەکـە دابمەرزێ شەرعیی نیە ،لە فـەرموودەی(صـحیح)دا هـاتوە: کـچێك چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) گوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا بـابم منـی بـەمێرد داوە و داومـی بـە برازایـەکی خـۆی،منیش بـەو ئامۆزایـەم ڕازی نیم،تـۆ دەفـەرمووی چـی؟ پێغەمبـەر (ﷺ) فـــەرمووی : ئـــەوەی کـــە بابـــت بڕیـــاری داوە ئێمـــە هەڵمانوەشاندەوە ،مادام تۆ پێی،ڕازی نی بۆ خۆت سەرپشکی،دوایی کچەکە بۆ خۆی گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا قەیدی نیە مـن ڕازی دەبم بەڵام هەر ویستم پیاوان بزانن کـە بۆیـان نیـە زەبـر و زۆر لـە ئافرەتان بکەن و بە نا بەدڵی خۆیان بەشوویان بدەن.

لێرەدا تەماشا دەکەین پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو (نکـاح)ەی هەڵوەشاندەوە کـە بـەبێ پـرس و ڕەزامەنـدیی ئافرەتەکـە بڕیـاری لەسەر دراوە!

ئنجا ئەو عادەت و نەریتەی کە لەسەر بنچینەی خزمایەتی و بەرەگەریی باوە،بۆ وێنە: ئەوە شێخ و سەیدە نابێ مێرد بە غەیری خۆیان و خەڵکی دیکە بکات و،ئەویان ئاغا یان کۆێخایە نابێ مێرد بە خەڵکی دیکە بکات و فلان عەشیرەت و هۆز و تیرەیە نابێ ئافرەتانیان لە چوارچێوەی عەشیرەتەکەیان دەربچن و...هیتد،ئەوە بێگومان هیچی لە ئیسلام و لە شەریعەتی خوای بەرزو مەزن دا نیە! پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێ: {اذا جاءكم من ترضون دينه و خلقه فانكحوه، الاتفعلوا تكن فتنة في الأرض و فساد كبير...[20]}واتە: هەرکەسێك هات بۆلاتان لە دینداریی و خوو ڕەوشتی ڕازی بوون ئافرەتی پێ بدەن- بیانووی دیکەی لێ مەگرن کە دەبێ ماڵ و سامانی ئەوەندەبێ و کۆشك و خانووبەرەی وابێ و فلان عەشیرەتی بێ و مووچەی هەبێ و بەرپرسیارێتی هەبێ و ...هتد- ئەوە مەکەن ئەگەرنا ئاشووب و ئاژاوە و خراپەیەکی زۆر لە زەوی دا بلاودەبێتەوە،- وەك ئێستا- .

کەواتە ئێمە بۆ چارەسەری ئەو عادەت و نەریتە نەفامی (جاهیلی)یە و سەرجەم ئەو دیاردە نەفامی یانەی کە هەن لە نێو کۆمەڵگاکەماندا،وە ئافرەت تێیاندا چەوسێندراوەتەوە و مافی پێشێل کراوە،چارەسەر ئەوە نیە واز لە ئیسلام و شەریعەتی خوا بێنین،بەڵکو چارسەر ئەوەیە بگەڕێینەوە بۆ باوەشی ئەم دینە،ئەو

[20] رواه الترمذي و حسنه.

ژەنگ و ژارو خلّت و خالّولیتەو لالّەی کە لە دین ئالآوە ئەوانەی لیّ پاك بكەینەوە،لە راستی دا ئیّمە بە هۆی دووركەوتنەوە لە ئیسلام گیرۆدەی کۆمەلّیّك عادەت و نەریّتی نەفامی سەیر و سەمەرە بووین لەسەرجەم بوارەکانی ژیان دا بە تایبەت لە بواری ژن و ژنخوازی و لە مەسەلەی هەلّس و کەوت لەگەلّ ئافرەتان دا،بۆ ویّنە: پیاوی وا هەیە پیّی عەیبە کە هاتەوە بۆ مالّ سەلام لە خیّزان و هاوسەرەکەی بکات و دەلّیّ: جا عەیب نیە پیاو سەلام لە خیّزانی خۆی بکات؟! یان کە دەچیّ بۆ سەفەریّك پیّی نەنگە و عەیبە پرس بە خیّزانەکەی بکات و راویّژ و مەشوەرەتی پیّ بکات،ئیّ برام ئەوە جەهالەتە! پیّغەمبەری خوا (ﷺ) نەك هەر لە ئیش وکاری مالّەوەدا بەلّکو لە کاروباری سیاسیی دا گرفتی گەورەی بۆ هاتە پیّش،پرسی بە(ام سلیمە)ی خیّزانی کرد (خوای لیّ رازی بیّت) ئەویش ریّیەکی پیشاندا و گوتی: ئەی پیّغەمبەری خوا (ﷺ) ئاوا بکە بۆ ئەوەی بۆ ئەو قەیرانە سیاسیی یە دەربازبی،ئەوە بوو بەقسەی کرد و قازانجیشی کرد!

عائیشەی دایکی ئیمانداران(خوای لیّ رازی بیّ) زۆر جار پیاوانی گەورە گەورە لە هاوەلّان کیّشە و مشت و مڕیّکیان دەبوو دەچوون(عائیشە)یان دەکردە دادوەر و دەیانگوت: ئەی دایکی ئیمانداران لەو بارەوە تۆ چ زانیاری یەکت هەیە؟ ئایا پیّغەمبەری خوا (ﷺ) چی فەرمووە؟ ئەویش کیّشە و گرفتەکەی بۆ یەکلا

دەکردنەوە و پێی ڕاگەیاندن کە پێغەمبەر(ﷺ) ئاوای فەرمووە و ئاوای کردوە و ...هتد؟

تەوەری چوارەم

چارەسەر

لە کۆتایی دا چارەسەری ڕاست و شەرعیی – خوشکەکانم! – بۆ ئەو دیاردە و حاڵەتەی کە هەیە کە دەویسترێ ئافرەت لە ئیسلام دوور بخرێتەوە،چارەسەر ئەوەیە بەڕاستی هەموومان بە میللەت و جەماوەرەوە بە حکوومەت و ئیدارەوە بەلایەنە سیاسییە یەکانەوە هەموومان بگەڕێینەوە سەر ڕەسەنایەتیی خۆمان،ئێمە میللەتێکی مسوڵمانین،ئێمە لە دەستووری خۆشماندا-دەستووری عێراق- کە هەموومانبەلێ دەنگمان بۆ داوە گوتوومانە: دینی ڕەسمی دەوڵەت ئیسلامە،وە نابێ هیچ یاسایەك دەربچێ کە پێچەوانەی شەریعەت بێ.

کەواتە بابگەڕێینەوە سەر ڕەسەنایەتی خۆمان،وە با چی دیکە لێدوان و قسەی دوژمنان ناحەزانی میللەتەکەمان بەسەر خۆمانەوە سوار نەکەین،بەراستی ڕاگەیاندنی ئێمەی کورد لە کوردستان- ڕاگەیاندنی لایەنی عەلمانیی و دەستەڵاتدار- ڕووی ڕاستەقینەی نەتەوەکەمان و ڕەسەنایەتی یەکەی شێواندوە! کە ماشاء الله ئەوەندەی لە ڕاگەیاندنی کوردی دا تەپڵ و تووزەڵە و مۆسیقا و شایی و ڕەش بەڵەك و تێکەڵ و پێکەڵی و شتی سەیر و سەمەرە دەبینرێ لە هیچ کەناڵێکی دنیادا بەو شێوەیە نیە،مەگەر

ئەو کەناڵانەی کە تایبەت کراون بە ڕەواج پێدانی فاحیشەگەریی و کاری نابەجێ،ئەگەرنا هیچ کەناڵێك بە ئەندازەی کەناڵە کوردی یەکان بەو شێوەیە سەرقاڵی گۆرانیی و سەما و هەڵپەرکێ نین،ئێمە حەز دەکەین ڕاگەیاندمان ئەوەی کە باسی ئافرەت دەکات و ئاراستەی ئافرەت دەکرێ لە خزمەت ئافرەت دا بێ،با بۆیان باسی زانیاری و زانست،پیشەسازیی و داهێنان بکرێ، بۆیان باسی ئەوە بکرێ کە شارەزا و چاوکراوە بن و بزانن چۆن ئەرکی سەرشانیان ڕادەپەڕێنن و چۆن ئەرکە سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و خێزانی یەکانیان جێبەجێ دەکەن! با ئافرەتان زیاتر مەجالیان پێ بدرێ کە لە بواری سیاسیی و کۆمەڵایەتیی دا ڕۆڵی خۆیان ببینن.

ئنجا ئەو برادەرە عەلمانیی یانەش، کە ڕەواج بەو مەسەلانە دەدەن و بە حیساب دڵسۆزن بۆ مافی ئافرەت،پێیان دەڵێین: لەگەڵ خێزانەکانی خۆیاندا باش بن،مەجالیان پێ بدەن،پرس و ڕاتان پێیان هەبێ و ڕاوێژیان پێ بکەن،ڕێز و حورمەتیان بگرن،چونکە ئێمە دەبیستین زۆریان بە پێچەوانەوە مامەڵە لەگەڵ خێزانەکانیاندا دەکەن! وەك مەسەلەی ئەو(مەلا)یەی لێهاتوە کە ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد و دەیگوت دەبێ ئاوا و ئاوا بکەن, دوایی مەلاژن گوتی :مامۆستا ئەدی نابێ فلانەشتە ئاوابێ؟ ئەویش گوتی :مەلاژن خۆ من هەر لەگەڵ خەڵکیمە و لەگەڵ خۆمانم نیە!

لەڕاستی دا ئەگەر ئێمە شتی باشمان بۆ ئافرەت دەوێ، دەبێ پێشێ لەگەڵ ماڵ و خێزانی خۆمان جێ بەجێی بکەین، ئەگەر

دەمانەوێ ئازادیی هەبێ با ئازادیی بدەین بە خێزانی خۆمان لە چوارچێوەی ماڵدا و با مەجالی بدەینێ دوو قسەبکات و رەخنەبگرێ، بە ڕاستی ئێمە ئەوەمان زۆر پێ چاکە، لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) ئافرەتان ڕۆڵی گاریگەریی خۆیان بینیوە لە سەرجەم بوارەکاندا، هەروەها لە سەردەمی دەستەلاتی ئیسلامی دا ئافرەت توانیویەتی ڕەخنە بگرێ لە گەورەترین کاربەدەستی مسوڵمانان، لە خەلیفەی مسوڵمانان بۆ وێنە لە (عمر بن الخطاب)خوا لێی ڕازی بێ.(٢٢)

با ڕەخنە بگرن،مەجالیان پێ بدرێ،داوای مافەکانیان بکەن،بەڵام لە چوارچێوەی شەریعەتی خوای پەروەردگاردا، لە چوارچێوەیەك دا کە بە بەرژەوەندیی و قازانج و بەختەوەریی دنیا و دوا ڕۆژیان تەواو دەبێ و لە دنیا و دوارۆژدا لێی بەهرەمەند و سوودمەند دەبن.[21]

ئەوە کورتەیەك بوو لە باسی(بە دوور خستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ ژیانێك دەکەین!) کە زۆر بە گوشراویی پێشکەشمان کردن، لە ڕاستی دا لە هەموو ڕووەکانەوە زەرەر دەکەین و هیچ قازانجی لێ ناکەین،کاتێك کە ئافرەتانمان، خوشکانمان،ڕۆڵەکانمان،کچەکانمان لە خێزانێکی مسوڵمان دا لە

---

(١)- وەك لە بارەی دیاری کردنی ئەندازەی مارەیی(مهر)یەوە ئافرەتێك ڕەخنەی لێ گرت و ئەویش ڕەخنەکەی لێ قبووڵ کرد.

دایك دەبن، دایك و بابی مسولّمانی هەیە بەلاّم لە ئیسلام دوور دەخرێتەوە،دوایی تەماشا دەكەین وەك بەچكە مسولّمان نەبێ وەك بەچكە هەموو شتێك دەچێ! ئایا میللەتی ئێمە هیچ كێشەی نەماوە ئەوە نەبێ كە ئافرەتەكانمان بەو شێوەیە لێ بكرێت؟! تا ئیستا كێشەی سیاسیی مان چارەسەر نەبووە،تا ئێستا سنووری جوگرافیای كوردستانمان بۆ دیاری نەكراوە،وە كەركوك و چەندین شوێنی دیكەمان بۆ نەخراوەتەوە سەر هەرێمی كوردستان،فیدرالّیەتمان لێ نەسەلمێنراوە بە تەواویی،زۆر جار ئێمە هێلكەی خۆمان هەموو دەخەینە سەبەتەی ئەمریكاوە،ئایا لێی سەلماندووین كە فیدرالیەت مافێكی سیاسیی ئێمەیە و دانی بۆ پێداهێناوین؟! هەروەها نەتەوە یەكگرتووەكان دانی بۆ پێداهێناوین؟! ئێمە دەیان كێشەی گەورە گەورەمان هەن،پێویستە راگەیاندن و میدیاكانمان زیاتر ئاراستەی ئەوە بكەین كە ئەو كێشە و گرفتانەمان بۆ چارەسەر بن! نە كۆمەلّێك كێشە و گرفتی دیكە بۆ خۆمان و بە دەستی خۆمان دروست بكەین و دواییش لە ئەنجامدا كۆمەلّگاكەمان پێی گەندەلّ و پۆخەلّ بكەین كە دوایی نەزانین چۆن كێشە و گرفتەكانمان چارەسەر بكەین.

لە كۆتایی دا دەپاڕێمەوە و دەلّێم: خوایە دەرووی خێری زیاتر لە میللەتەكەمان بكەیەوە،هەموو لایەكمان بە قیادەی فیكریی و سیاسیی یەوە،بە دام و دەزگاكانی راگەیاندنەوە،بەهەموو چین و توێژەكانەوە،بە شێوەیەك بین كە لای تۆ پەسەند بین و لای

پێغەمبەری خوایش(ﷺ)بە ئومەت و شوێنکەوتەی ئەو لە قەڵەم بدرێین و لەو دەرد و نەخۆشیانە سەلامەت و پارێزراوبین کە لە ئەنجامی دوورکەوتنەوەمان لە دینی خوا پێیانەوە گرفتار و گیرۆدە دەبین لەسەر ئاستی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵیی و دەوڵەتیی،

وصلی الله و سلم علی محمد وعلی اله وصحبه أجمعین

والحمد الله رب العالمین

* وەڵامی هەندێك لە پرسیارەکانی خوشکان لە نێو کۆڕەکەدا:

(١)-پرسیار:زۆرێك لە ئافرەتانی ئیسلامی ئێمە لە کاتی شوو کردن(زواج)دا داوای مارەیی زۆر و نێوماڵی زۆر خانووبەرە و شتی تایبەتی خۆیان دەکەن،ئایا مافی شەرعیی مان هەیە بۆ ئەوە؟

وەڵام: لە شەریعەتی ئیسلام دا وا بە پەسەند و چاك زانراوە کە ئافرەت داوای مارەیی زۆر نەکەن،وەك فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ: {خيرهن أيسرهن مهوراً}رواه الطبراني عن ابن عباس،واتە: (باشترین ئافرەتان ئەوانەن کە مارەیی یان کەم بێ)، واتە برِو بیانوو نەگرن.

لەڕاستی دا لە جیاتی ئەوە دەبێ خوشکانی بەرێزمان مەرجی دیکە دابنێن لە خودی مرۆڤەکەدا- نەك لەماڵ و سامانی دا- ئایا ئەو مرۆڤە ئیمان و عەقیدە و بیروباوەڕی چۆنە؟ ئەخلاق و ڕەوشتی چۆنە؟ هەڵسوکەوتی چۆنە و ئایا ژیانی لەگەڵ دەکرێ، ناکرێ؟ ئایا ڕێك و ڕاستە؟ ئەو مەرجانە دابنێ باشترە و بە قازانجی دنیا و دوارِۆژیان تەواو دەبێ وەك چۆن پێغەمبەر(ﷺ) بە پیاوانیشی

هەروا فەرمووە کە دەفەرموێ: {تنكح المرأة لأربع :لمالها و لجمالها و لحسبها ولدينها،فاظفر بذات الدين تربت يداك} رواه البخاري و مسلم و أبوداود و ابن ماجه،واتە: (ئافرەت لەبەر چوار شت بە هاوسەر دەگیرێ: لەبەر ماڵ و سامانی،حەسەب و نەسەبی،جوانیی،دینداري،جا تۆ هەوڵ بۆ خاوەن دینەکەیان بدە-واتە ئەوەی دین و ڕەوشت و نێوەرۆك(محتوی)ی چاکترە-ئەگەرنا دەستت بە زەوی یەوە بنووسێ لەبەر نەداریی)

بەڵێ لەشەریعەت دا مەجال دراوە کە ئافرەت مارەیی زۆربێ،ئەوە دیارە،بەڵام بێگومان بە پەسەند زانراوە کە ئافرەت داوای مارەیی زۆر نەکات و مەرجی ماددی قورس و گران دانەنێ،وە لە ڕاستی دا مەرجی قورس دانانیش لەمەسەلەی ژن و ژنخوازیی دا دەبێتە هۆی ئەوەی کە پرۆسەی ژنهێنان دوا بکەوێ و گرفتی بێتە ڕێ،کە ئەوەش هەم کوڕەکان ناچنە پێش و سارد دەبنەوە لە ژنهێنان، کە دەبینێ ئافرەتەکە داوای مارەیی و نێومالّی زۆر و سەیارە و خانووبەرەی چاك دەکات،وە هەم کچەکانیش دەمێننەوە و قەیرە دەبن و شوویان بۆناکرێ!

(٢)-پرسیار: زۆرێك لە ڕێکخراوەکانی ئافرەتان خۆیان لەیەك جیا دەکەنەوە و پەیوەندیی و هاوکاری یان لە نێواندا نیە،بۆچی ئێوە بڕیارێکی گشتی بۆ ڕێکخراوەکانی ئافرەتانی خۆتان دەرناکەن تا بیسەلمێنن کە ئیسلام ڕۆڵی هاوکاری و پەیوەندی و پێکەوە ژیانی هەیە.

وەڵام: لەڕاستی دا ئێمە لە نێو یەك كۆمەڵگادایین،جا وەك چۆن لایەنە سیاسییە یەكان لەو خاڵانەدا كە تێیاندا هاوبەشن دەبێ هاوكاری یەكدی بكەن و هەماهەنگی یان پێكەوە هەبێ،بەهەمان شێوەش دەبێ ڕێكخراوەكان چاكتر هاوكاری یەكتر بكەن،چونكە زۆرجار ئامانجی سیاسیی لەیەكتر دوور هەیە،بەڵام ڕێكخراوە مەدەنی یەكان و بە تایبەت ڕێكخراوەكانی ئافرەتان پێم وایە لە زۆر شت دا ئامانجیان یەكێكە،ئافرەتانی هەموو ڕێكخراوەكان بۆ ئەوە تێدەكۆشن كە ماف و ئازادی یەكانی ئافرەتان دابین بكرێت و ڕێزو كەرامەت و كەسایەتیی ئافرەتان پایزراوبی،وە مەجالی كار و چالاكی یان هەبێ و ڕۆڵی خۆیان لە كۆمەڵگا دا ببینن و حیسابیان بۆ بكرێ،واتە سەرجەم ڕێكخراوەكانی ئافرەتان لەوانەدا هاوبەشن،بۆیە هاوكاری كردنیان لەگەڵ یەكتر زۆر پێویستە.

وە ئێمە لێرەوە ڕایدەگەیەنین وەك خۆمان-كۆمەڵی ئیسلامیی- كە پێویستە لەسەر خوشكانی كۆمەڵی ئیسلامیی هەوڵبدەن دەست پێشخەر بن لە هاوكاری كردن و پێكەوە كاركردن لەگەڵ هەموو ئەو ڕێكخراوانە كە بە دڵسۆزیی بۆ ئافرەتان كاردەكەن.

(٣)-پرسیار: زۆر سوپاسی بەڕێزتان دەكەم بۆ سازدانی ئەم كۆڕە،بەڕاستی كۆڕێكی زۆر سەركەوتوو بوو،وە سوودێكی زۆرمان لێ وەرگرت،بەڕێزت ئاماژەت بەوەكرد كە لە شەریعەتی ئیسلام دا جیاوازی نەكراوە لە نێوان ژن و پیاودا تەنیا لە كاركردن دا نەبێ،بەڵام وەك دەبینین زۆر جیاوازی كراوە بۆ نموونە: لە وەرگرتنی

میرات وەك یەك نین تەنیا لە زەوی کوشتوکاڵی دا وەك یەکن،ئایا ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ دین یاخود بۆ ئەوەی کە پیاو داڕێژەری یاسایە.؟!

وەڵام: هەندێك کەس وا دەزانێ کە هەمیشە لە ئیسلام دا پیاو دوو ئەوەندەی ئافرەت میرات دەگرێ! بۆ زانیاریتان ئەوە بەو شێوەیە نیە،چونکە ئەو ئایەتە قورئانی یەی کە دەفەرموێ:﴿وللذكر مثل حظ الأنثيين﴾ النساء-١١-،ئەوە مەبەستی کوڕان و کچانە،واتە کاتێك بابێك دەمرێ و کوڕ و کچی لە دوا بەجێ دەمێنن، کوڕەکان دوو ئەوەندوی کچەکان میرات دەگرن!بێگومان ئەوەش حیکمەتی زۆری تێدایە وەك ئێستا ڕوونی دەکەمەوە،ئەگەرنا مەسەلەی دایك و باب کاتێك کە میرات لە کوڕەکانیان دەگرن هەردووکیان(شەش یەك)دەگرن، واتە بە ئەندازەی یەکدی دەگرن وەك خوا فەرموویەتی: {...ولأبويه لكل واحد منهما السدس مماترك ان كان له ولد}النساء-١١-.بەڵکو جاری وا هەیە ئافرەت لە پیاو زیاتر میرات دەگرێ،کەواتە مەسەلەی{للذكر مثل حَظّ الانثيين}واتە: بۆ نێر هەیە دوو ئەوەندەی مێ،ئەو تەنیا دەربارەی کوڕان و کچانە،حیکمەتەکەشی ئەوەیە کە لە ئیسلام دا کوڕ ژن دێنێ پێویستە مارەیی ئەو ژنە بدات و نەفەقەی بدات،وە مەسرەفی خێزان دروستکردن لەسەر کوڕە،بۆیە لە میراتی بابی دا زیاتری بەش دەدرێ بۆ ئەوەی ئەو پێداویستی یانەی ماڵداری و پێکەوەنانی خێزانی پێ‌جێ‌بەجێ بکات،واتە ئەو پێداویستی یانەی کوڕەکە

ڕەچاوكراوە،بەڵام كچ كە شوو دەكات - نە مارەیی لەسەرە و نە ماڵ پێكەوەنانی لەسەرە و نەداوای نەفەقـەی لێ دەكرێ،بۆیـە كـچ كـە نیوەی میراتەكەی بەش دەدرێ لەبەر ئەوەیە كە هـیچ مەسـرەفێكی لەسەر نیە،بەڵام برایەكەی كە ژن دەهێنێ پێویـستە هـەموو ئـەو مەسرەفانە بكات،جا شەریعەت لەوەدا موراعاتی كوڕەكەی كردووەو زیاتری پێداوە چونكە زیاتری پێویست دەبێ،ئەگەرنا وەك گوتمان:

باب و دایك كاتێك كوڕیان دەمرێ هەردووكیان (شـەش یـەك) دەگرن بە ئەندازەی یـەك،وە هەنـدێك حالـەت هەیـە كـە ئـافرەت زیاتریش لە پیاو میرات دەگرێ.

پرسیار: بەڕێزتان باسی بەرەڵلایی و ئەو شتانەت كرد،لام وابێ چارەسەری هەر باش ئەوەیە بەڕای من كە دین لـە دەسـەڵات جیـا بكرێتەوە،چونكە ئەو كاتە دین قودسیەتی خـۆی دەبـێ وە تێكـەڵ نابـێ لەگەڵدەسـەڵات،وە پیـاوانی دەسـەڵاتدار نـاتوانن گاڵتـە و سوكایەتیی بە دین بكەن،ئیتر سوپاس.

وەڵام: سوپاسـی ئـەو خوشـكە بـەڕێزە دەكەین،لـەوەڵامی ئـەو پرسیارەدا دەڵێم: خوشكە بەڕێزەكەم! ئیستە دین لە دەسەڵات جیـا كراوەتەوە بۆیە گیرۆدەی ئـەو دەرد و نەخۆشـی و كێـشەو گرفتانـە بووین! خۆ ئێـستا برادەرانـی دەسـەڵاتدار بانگەشـەی عەلمانیـەت دەكەن و دەڵێن حوكمەكەمان حـوكمێكی عـەلمانی یـەو دیـن لـە دەسەڵات جیایە، لەگەڵ ئەوەشدا توشی ئەم وەزعە بوین!

ئەنجا لە ڕاستی دا کاتێك دین لەگەڵ دەسەڵات ئاوێتە بێ – چونکە لە ئیسلامدا دین و دەوڵەت یەك شتە- ئەو دینە نینۆکی ئەو دەسەڵاتە دەکات و ناهێڵێ زوڵم بکات وە ناهێڵێ فەساد و گەندەڵی سیاسیی ئیداریی و ئابووری هەبێ،ناهێڵێ ئەو دەسەڵاتە هەموو ئیمتیاز و تایبەتمەندی یەکان بۆ خۆی قۆرخ بکات و میللەتی لێ بێ بەش بکات! بۆیە لە کاتێك دا کە دەسەڵات دیندار بێ و دین و دەسەڵات ئاوێتەی یەکدی بن و دین تەوجیهی دەسەڵات بکات،ئەو دەسەڵاتە نابێتە ملۆزمێك وەك ئێستا کە دەیبینین، ئەو دەسەڵاتە کۆمەڵێك سنووری بۆ دادەنرێن، چونکە هەر لە ڕێوە دین دەڵێ: دەبێ دەسەڵاتدار خەڵك هەڵیبژێرێ و کاربەدەستان و مشوورخۆران دەبێ هەڵقوڵاوی ئیرادەی خەڵك و جەماوەر بن وەك خوای بەرز و مەزن دەفەرموێ{و امرهم شوری بینهم} الشوری-٣٨-.

پاشان ئەگەر دین حاکم بێ، خەڵك دەبێ بە چاودێر بەسەر دەسەڵاتەوە،و خەڵکەکە لەسەر خۆیشی واجب دەزانێ کە ڕەخنە لە دەسەڵات بگرێ وە هەڵەکان ڕاست بکاتەوە،و دەبێ ئەو دەسەڵاتەش لەسەر خۆی بە واجب ببینێ گوێ بۆ ڕەخنە و تێبینی و چاودێری و سەرنج و پێشنیاری خەڵك بگرێ،وەك لەو سەردەمی کە ئیسلام حوکمی کردوە بەو شێوەیە بووە،کەواتە بە پێچەوانەوە ئەوەی ئێستا بەرهەمی ئەوەیە کە دین لە دەسەڵات دوور خراوەتەوە بۆیە ئێمە تووشی ئەوە ئاشووبە سیاسیی و خێزانیی و ڕەوشتی یە بووین،بەڵام

ئەگەر دین دەوری خۆی پێبدرێ ئەو گرفت و کێشانە کە ئێستا بە دەستیانەوە گیرۆدە بووین و پێیانەوە دەناڵێنین بە دڵنیایی یەوە چارەسەر دەکرێن.

(٥)-پرسیار: ئایا ئافرەتی قوتابی بۆی هەیە کە لە وەرزش دا بەشدار بێ،چالاکی یە وەرزشی یەکان بەگشتی و بەتایبەتی فیستیڤاڵی ساڵانەی قوتابخانەکان؟

وەڵام: هەڵبەتە لە ئیسلام دا ڕێ لە ئافرەت نەگیراوە کە وەرزش بکات،بەڵام ئیسلام ڕێ بە تێکەڵیی ئافرەت و پیاو نادات لەکاتی وەرزش دا،چونکە بێگومان وەرزش کردن دا جەستەی ئافرەت و مێیینایەتی(أنوثـة)ی زیاتر بەدەر دەکەوێ و بەرجەستە دەبێ،مانای وایە دەبێتە پێشانگا(معرض)ێك بۆ ئەوەی پیاوان سەرنجی بدەن و تەماشای بکەن! ئەگەرنا ئافرەتان لە شوێنی تایبەتی خۆیاندا بۆیان هەیە وەرزش بکەن و هەموو چالاکی یەکی وەرزشی ئەنجام بدەن بەتایبەت ئەوەی کە لەگەڵ سروشتیان دا دەگونجێ،ئیسلام ئافرەتی قەدەغە نەکردوە وەرزش بکات،بەڵام بە ئادابێکی شەرعی یەوەو لە نێوان خۆیاندا،وە ئەگەر بێینە سەر باری حەقیش بەڕاستی ئافرەت پێویستی بەوە نیە لەگەڵ کوڕاندا یاری تۆپی پێ و باڵە و جۆرەکانی دیکەی یاری بکات،بەڵکو دەبێ بۆ خۆیان بیکەن و کوڕانیش هەروا بۆ خۆیان بیکەن،وە لە دنیاش دا وەك دەبینن زیاتر هەر بەو شێوەیەیە.

(٦)-پرسیار: دەربارەی تێکەڵیی کوڕان و کچان لە قوتابخانەکان دا چی دەڵێن؟

وەڵام: لەو بارەوە دیارە ئێمە زۆرمان پێناخۆشە کوڕان و کچان تێکەڵ بن لە قوتابخانەکاندا و پەیمانگا و زانکۆکاندا،وە بێگومان ئەوەش یەکێکە لەو شتانەی کە دەسەڵات بەکاری دێنێ بەڵام بەزەرەری میللەت تەواو دەبێ،ئێستا لە ئەمریکا کار لەسەر ئەوە دەکرێ کە تێکەڵی کوڕان و کچان لە خوێندن دا نەمێنێ،وە ئێستا لە وڵاتانی ئەوروپا لە ئەنجامی ئەوەدا کە ئافرەت و پیاویان تێکەڵ کردوە لە قۆناغەکانی خوێندن دا بۆیان دەرکەوتوە کە ئاستی زانیاریی پیاوان و ئافرەتانیشیان هاتۆتە خوارێ،بۆچی؟چونکە وروژاندنی غەریزەی جینسی و بەیەکەوە مەشغوولبوون و پاشان چەندین شتی دیکەی خراپی بە دوادا دێ،کە هەرخۆش نیە لەم کۆڕەدا ئامەژەیان پێبکەین! زۆر جار ئافرەتان دەچنە قۆناغی ئامادەیی حامیلە دەبن و دەبنە دایك و منداڵیان دەبێ بەبێ ئەوەی کە مێردیان دیاربێ! بۆیە لە ئەنجامی ئەو نەخۆشی و گرفتاری یانەدا ئەوان-خەڵکی ئەوروپا- خۆیان هاتوونە سەر ئەوە کە لە قۆناغەکانی خوێندنی باڵادا ئافرەتان وپیاوان،کوڕان و کچان لەیەك جیا بکەنەوە،ئنجا ئەوەی خەڵك زەرەری لێ کردوە پێویستە ئێمە پەندی لێوەر بگرین نەك ئێمەش بە هەمان هەڵەی ئەوان بڕۆین.

(٧)-پرسیار: ئایا ئـافرەتێکی مـسولّمان و پۆشـتـە شـوو بـە کەسـێکی نامـسولّمان بکـا لەبـەر ئـەوەی کەسـێکی مـسولّمان داخوازی ناکات ئەوە چ حوکمێکی هەیە؟

وەلاّم: ئەگەر کەسێك ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی نەبێ و بـڕوای بە ئیسلام نەبێ،ئەوە دروست نیە ئـافرەتی مـسولّمان شـووی پـێ بکات! بەلاّم ئەگەر کەسێك ئیمـان و عەقیـدەی ئیـسلامی هـەبێ بەلاّم هەلّە و ناشەرعی و کەم وکووڕی هەبێ ئەوە دروسـتە شـووی پێ بکات،ئەلّبەتە وا باشتر و پەسەندترە ئەو ئافرەتە مسولّمانە بـۆ پیاوی دیندار و خاوەن ڕەوشتی بەرز و پابەنـد بـە شـەرعی خـواوە بگەڕێ،دوایی ئەگەر شووی پێ کـرد مـادام مێردەکـەی خـۆی بـە مسولّمان دەزانێ پێویستە ئەو ئافرەتە هـەولّی لەگـەلّ بـدات کـە پابەند بێ بە شەریعەتەوە بە قسەی خۆش بە هەر شێوەیەك کە بۆی دەگونجێ،بەلاّم ئەگەر ئەو کەسە هـەر بـڕوای بـە ئیـسلام نـەبێ و کافربێ ،ئـەوە دیـارە دروسـت نیـە شـووی پـێ بکات،واتـە هـەر گرێبەند(عقـد)ی نیکاحەکـەی دانەمـەزراوە و دانامـەزرێ مـادام عەقیدە و بیروبڕوایان لەیەك جیابێ.

(٨)پرسیار: ...هەمووموان دەزانین کە مافەکانمان لە ئیـسلام دا یاسایی و شەرعی یە بەلاّم مامۆستا گیان بـە ڕای بـەڕێزتان ئـەو هۆیانە چین کە بوونەتە هۆی ئەوە کـە ئافرەتـان لـە ئیـسلام دوور بکەونەوە؟

وەڵام: من پێم وایە ئەوەی کاریگەری هەبووە لەوەدا کە بەشێك لە ئافرەتانی ئێمە لە ئیسلام دووور بکەونەوە یا خود بەرەو دوور کەوتنەوە بچن، هەم کەم و کورِي خودی مسوڵمانان خۆیان بووە ،کەمتەرخەمی مامۆستایەکان،کەمتەرخەمی باب و دایکان،حاڵی نەبوون لە ئیسلام،بەڵکو زۆر جاران بە سەرو بنی لە ئیسلام حاڵی بوون! وەختێ کەسێك بەو شێوەیە لە ئیسلام حاڵی بێ کە ئیسلام رێ بە ئافرەت نادات رۆڵی خۆی ببینێ و مافی پێ نادات، دیارە هەر بەو شێوەیەش لەگەڵ ئافرەت مامەڵە دەکات،ئەو کاتە ئافرەتەکە خۆی بە ستەم لێکرا و ماف خوراو دەزانێ و دوور دەکەوێتەوە ،کەواتە بەهەڵە تێگەیشتن لە ئیسلام و بە هەڵە مامەڵە کردن بە ناوی ئیسلامەوە لەگەڵ ئافرەت ،کاریگەری خراپی بووە،و هەم ئەو شەپۆلە ماددی یەی کە لە ئارادایە دەوری زۆر خراپی گێراوە لەوەدا ،ئاشکرایە شەپۆلێکی ماددیگەرایی لە دونیادا هەیە بۆ بێ بەند و باریی و بە دەمەوە چوونی فەساد ،بۆ خۆتان دەبینن و دەبیستن لە وڵاتاندا ئەوە چەند جارێك لەو کۆنگرانەی کە دەربارەی ئافرەت گیراون بە راشکاویی باسی ئەوە دەکرێ کە دەبێ رێ بدرێ پیاوێك و پیاوێك خێزان پێکەوە بنێن،و ئافرەتێك و ئافرەتێك خێزان پێکەوە بنێن و..هتد!!

کەبێگومان ئەو رێرەوە(اتجاه)ە چەوتە وێرای تێکگیرانی لەگەڵ فیترەتی مرۆڤ و عەقڵ و لۆژیك دا سەریش دەکێشێ بۆ بنە برِبوونی نەسڵ و وەچەی بەشەر و قەڵاچۆ بوونی!.

جائەمانە هەموویان وێکرا کاریگەریی یان هەبووە و هەیە لە سەر دوورکەوتنەوەی بەشێك لە ئافرەتان لە ئیسلام.

## نێوەڕۆک

لەم نامیلکەیەدا

روونکراوەتەوەوە کە کاتێك ئافرەت لەئیسلامدا دووردەخرێتەوە. هەم خۆی و هەم کۆمەڵگاکەش بە نێر و مێ و ورد و درشتەوە لە هەموو بوارەکانی ژیان و گوزەران دا دووچاری چەندان جۆرە دەردو نەخۆشی و گرفت و کێشە دەبن .

هەروەها رونیشکراوەتەوە کە هەموو ئەو بیانوو و پاساوانەی بۆپاساودانەوەی وەدورخستنی ئافرەت لەئیسلامدا لەکۆمەڵگاکەماندا ، دەهێننەوەو وەك : ئازادی و ماف بۆدابین کران و ...هتد هەموویان شتی پووچ و بێ بناغەن ، چونکە شەریعەتی خوای کاربەجێ ئازادیی و ماف و بەرژەوەندی هەموولایەکی بەچاکترین شێوە دابین کردون .

نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و راگەیاندن

tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر تونێلی شوێن پالاس
ت: 2518138 – 2230908 – 2221695
موبایل : 07504605122 – 07701387291